## ● تەمی سەر خەرەند

ڕۆمان

● شێرزاد حەسەن



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

ڕۆمان

# تەمی سەر خەرەند

شێرزاد حەسەن



ناوی کتێب:تەمی سەر خەرەند – ڕۆمان
نووسینی: شێرزاد حەسەن
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٨٢
دەرهێنانی هونەری ناوەوە: بەدران ئەحمەد
دەرهێنانی هونەریی بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
خۆشنووسیی بەرگ: محەمەد زادە
وێنەی بەرگ: قادر میرخان
پیت لێدان: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
هەڵەگریی کۆمپیوتەری: عەزیز عەبدولخالیق
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمان مەحموود
تیرێژی چاپ: ٢٠٠٠ دانە
چاپی یەکەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٣
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٩٦)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

**پێشکەشە بە:**

- پلکە خەجێ... حەکایەتەکانی، کە بەیەکەوە لە گۆڕنران

هەر دوای گــەڕانەوەم لە غــەریبــیی، لە پاش کــۆچ و ســەرهەڵگرتنی چەندەها ساڵ، ویڵ بوونم دەنێو شاخ و کێوان، دەربەدەریم دەنێو گوند و شاران، چەشنی سەرما و گەرما، تاڵی و سوێری، هیوا و دڵساردی، سەرکەوتن و نوشوستی... تاکە خەونێکم ئەوەبوو ڕۆژێک بێ و بۆم بڕەخسێ بگەڕێمەوە مەڵبەندی منداڵی، چ بەتاسە و ترس و تاسووقەوە گەڕامەوە، تاسەی ئەوەی کەسەکان مابن و نەمردبن، چش لەوەی گەورەتر و پیرتر بووبن، بەڵام خۆزگەم دەخواست جارێکی دیکە لە باوەشیان بگرمەوە، لە هەر هەموو خەونەکانمدا هەر دەگەڕامەوە ئەوێندەرێ، من تەنها لەسەر نامە و پۆست کارتەکان دەژیام و دەلەوەڕام، بۆن و دەنگ و ڕەنگی خەڵک و خاکم لەناو ئەو چەند دێڕانەدا دەبینی کە لەسەر پشتی کارتەکان و ڕێنووسی پڕ لە هەڵەی نامەکاندا دەمخوێندەوە و کەچی تا دەهات لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا کاڵ دەبوونەوە، من دەمزانی زۆربەی دەنگوباس و خواس و هەواڵەکان دڵخۆشکەرە و درۆن، چونکە لە خەیاڵ و خەونەکانمدا هەمیشە شتی پێچەوانەم دەبینی؛ کۆست و کارەسات، من بەتەمای شتی گەورە نەبووم، بەلای منەوە زۆر سەیر بوو بۆ جارێکی تر گوێم لە بانگی کەڵەشێرێک بێ لە گەرد و گوڵی بەیانییەکدا، بۆڕەی مانگایەک، وەڕینی سەگێک، زەڕینی کتوپڕی نێرەکەرێک، پڕ بەهەردوو چاوان خۆر ببینم بەتاقی ئاسمانەوە دەدرەوشێتەوە، شەوانەش تا خەو دەمباتەوە خۆم لەژێر تریفەی زیوینی مانگدا بشۆم، من دڵنیا بووم کە ئاسمان تەنها لە وڵاتی مندا ئەوەندە شینە، شینێک کە لە هیچ ئاسمانێکی دیکەدا نەمبینیوە، لە هەر شوێنێکدا دڵم تەنگ بووایە ئەو شەوە خۆشانەی هاوینم بەیادی خۆم دەهێنایەوە کە هەزارەها ئەستێرە بەدەم جریوەوە دەرژانە سەر سینە و سەرینەکەم، چەندە سەیر بوو بۆ جارێکی دیکە پڕ بەهەردوو گوێ لەناو کووچە و کۆڵانەکان گوێم لە هاتوهاواری منداڵە چەتوونەکان بێ، قاووقیژی ژنان، دەمەتەقێی زۆر سادە و پڕ لە هەڵچوونی تۆلاز و پیاوەکان، شەرمی کچێکی جحێڵ ببینم کە لە شەرمی هیچ کچێکی ئەم دونیایە ناچێ...





هەمیشە لە دوورەوە، لەبەر دیدە و خەیاڵمدا، تەمێک شتەکانی لێ تێکەڵ دەکردم... دەترسام لەوەی بگەڕێمەوە و شتەکان هەر هەموویان گۆڕابن، تا فرۆکەخانەکەش هاوڕێکانم دەیان ترساندم و دەیان وت: ئەوەندە خۆش خەیاڵ مەبە... گەر شتەکانیش نەگۆڕابن، تۆ ئەو کوڕەی جاران نیت و بینینی ئەمڕۆکەت بۆ شتەکان هی دوێنێ نییە، بەڵام کەسیان نەیاندەزانی کە لە ناو مندا، لە شوێنێکی پەنهانی ڕۆحمدا من هەر هەموو کەس و شوێن و زەمان و کۆی ڕووداوەکانم هەڵگرتووە، ئەوان نەیاندەزانی لەناو مندا منداڵێک هەیە و هەرگیز گەورە نەبووە و نابێ، بەدرێژایی سێ سەعات فڕین بەئاسمانەوە من هەر خولیا و سەرگەرمی خوێندنەوەی ڕۆمانە ناوازەکەی (کۆنستانتین جۆرجیۆ) بووم و خواخوام بوو بگەمە کۆتایی و بزانم پاڵەوانەکەی چی بەسەردێ، لە یەکێک لە کۆشکەکانی فرۆکەخانەی (بۆدابێست) کڕیبووم، ناوونیشانەکەی سەرنجی ڕاکێشام و بێ دوودڵی خستمە جانتاکەمەوە –ئەو پیاوەی بەتەنیا سەفەری کرد– بەڵام کە لە سنوور پەڕیمەوە ڕۆمانەکەم خستەوە ناو جانتاکە و لە داروبەرد و مەل و مەردوومەکان ڕادەمام، لەو هەموو شاخ و داخەی کە بۆ من بۆنی یەکەمین ساتەوەختی خەلیقەتی لێ دەهات، دڵم پڕ دەبوو لە گریان، ناشزانم بۆچی ئەوەندە سکم بەدرەختە تەنیاکانی لا ڕێگاکان دەسووتا، دەت وت چەند هەتیوێکی ڕووتی بەر هەتاو و بارانن، ئەو شاخانەش هەرگیز تۆکمە و بڵند و دامەزراو نەبوون، بۆچی وەها بێکەس دەهاتە بەرچاوم... نازانم.. جاران کە هێشتا هەرزە و خوێنگەرم بووم وام هەست دەکرد زوورگ و گردۆڵکەکان سینە و مەمکی ڕووتی چەند ژنێکی ڕاکشاون، دۆڵ و زەندۆڵەکانیش قووڵایی تاریک و نەرم و نیانی ئەو لەشە جوانە، هەر قلیشێکی قووڵ لە خاکدا ڕۆچوو دەبوو بەدۆڵانێکی پڕ لە گیای تەڕ و کەسکاییەکی تاریک، درەختەکانیش قژی پەخشی ئەو ژنە ڕاکشاوانە، ڕێ ڕێی تەلانە لووسەکانیش کە درێژ دەبوونەوە هەر کتومت دەتوت قۆڵ و باسک و قاچی ئەو ژنە شۆخانەن، دەکرێ خەیاڵم ئەوەندە و خەراپتر و

شەیتانی تر بووبێ... وەلێ چی بکەم کە ئەو سروشتەم لێ دەبوو بەسەدەها ئافرەتی ڕووت و خەوتوو... کەچی ئێستا ئەو سروشتە غەمگین و تەنیا و پەژموردە دەبینم، لەوە دەچوو سەدەها پیاوی دڵڕەق و خەنجەر بەدەست ئەو ژنە زۆر شۆخانەی ناو خەیاڵی منیان لە شیرین خەودا لەتوکوت کردبێ، لەبەرچاوانم ئەو ژنانە تەپاوتل لە خوێنی کەسکی خۆیان دەگەوزین و... هێدی هێدی شتەکان هەر هەموو لەبەرچاوانم هەلاهەلا دەبوون... شی دەبوونەوە... پەرت دەبوون... «با» دەیبردن... دەترسام... زۆر دەترسام شاخەکان وەک ئەوەی لە پەمۆ دروست بووبن ڕەشابەیەک لە ناکاو هەڵبکا و ڕووەو بیابانەکانی دونیا بیانگوێزێتەوە و جگە لە دەشتێکی ڕووت و قاقڕ هیچی تر بۆ ئێمە جێ نەمێنێ، نەمدەویست هیچ شتێک و دیمەنێک ببوێرم، بۆ چاوەکانم هەر هەموو شتەکان تازە و سەیر و خەمهێن بوون، هەندێک جاریش دڵخۆشکەرە، دەمویست دەیەها چاوی دیکە قەرز بکەم، تاکە شتێک کە ئەڵهام دەکرد و ببووە کەڵکەڵەی ڕۆحی هیلاک و غەریبم... تاکە خولیایەک کە بەدرێژایی ئەو چەند سەعاتە و چەندین ساڵی مانەوەم لە دەرەوە کە هەر هەموو خەیاڵی منی داگیر کردبوو: ئەوەبوو کە ئەگەر ببێ جارێکی دیکە بگەڕێمەوە مەڵبەندی منداڵی، یەکەمین هەوار کە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵانە لەبیرم نەدەچۆوە: سەر ئەو خەرەندە بوو کە لە ماڵەکەی خۆمانەوە بەسەد هەنگاوی وردی ئەوسام دەگەیشتمە سەر لێوارە ڕکەکەی، هەر واشم کرد... چونکە نەمویست هیچ کەسێک لەو گەڕانەوەیە ئاگادار بکەمەوە، حەزم دەکرد چوونەوەی کتوپڕم خورپەیەکی خۆش بێ لە دڵی کەسوکار، هەروەک لەناو حەکایەت و داستانەکاندا ڕوودەدا: کوڕی هەڵەتە و بزر لە ناکاو دێتەوە ماڵێ و هەر هەمووان سەرسام دەکا، هێدمە دەیانگرێ و دەم دادەپچڕن، هەرچەندە من دەمزانی کە هیچ شتێکی ئەوتۆم نییە کەس لە خزم و خوێیان سەرسام بکا، جگە لە جانتایەکی چکۆڵەی شان کە پڕ بوو لە خەم و تاسە و ئارەزوو... لە قەهر و غوربەت هیچی دیکەم پێ نەبوو، دەت وت ڕۆحی من وا لەناو ئەو خەرەندەدا عاسێ بووە و





بەر لە چوونەوە بۆ ناو کەسوکار مەرجە ئەو ڕۆحە هەڵدێراوەم بدۆزمەوە و ئەوسا خۆم بەخزم و خوێش پیشان بدەم، ڕۆحێکی ساوا کە لەو چەمە بەخوڕ و سەرشێتەی ناو خەرەندەکەدا خنکا، ڕۆحێک پڕ فیز و هەوای منداڵانە کە وەک بزنە شێتەکەم هەڵدێرا و هەپروون بەهەپروون بوو، هەر کوتێکی لەژێر دار و دەوەنێکدا بەجێما... سەدەها شەو خۆم دەدی؛ لە هەموو خەونەکانمدا کە چۆن چۆنی لەسەر لێواری خەرەندەکە ڕەتم دەبرد و پێم هەڵدەخلیسکا و سەرانگرێ دەبووم، ڕووە و قووڵایی خەرەندەکە کەللەی سەرم بەر تاشەبەردەکان دەکەوت و پارچە پارچە دەمردم، ئەو خەرەندە لە هەموو خەونەکانمدا بانگی دەکردم کە تا پیر نەبووم و نەمردووم بێمەوە و بۆ دواجار لەو ئەفسوون و سیحرە پڕ سام و ترسەی ڕابمێنم... هەر واشم کرد، چەندین گەراج و قەمەرەم گۆڕی، هەر دەت وت نامەوێ خیانەت لەگەڵ یەکەمین مەنزڵگای خۆم بکەم، دەمویست وەفادارانە ئەو قەرزە گەورەیە بدەمەوە... چ قەرزێک؟ نازانم... تا لە خەرەندەکە نزیکتر دەبووینەوە من غەمگینتر دەبووم، سەیر بوو... لە پەنجەرەی قەمەرەکەوە بەهەردوو بەری جادەکەدا دەمڕوانی و دەیەها ئەسپی مردووم بینی کە لێرە و لەوێ سەگەل تێیان وروکابوون، لەگەڵ گڕەگڕی تیژتێپەڕی قەمەرەکە لمۆزی خوێناویان لە کەلاکەکان هەڵدەگرت و بەترسەوە لە ئێمەیان دەڕوانی، لەوە مڕتر بوون بەدەم وەڕینەوە دوامان بکەون، دەت وت ناو دەندە و پەراسووەکانیان کە لە گۆشت داماڵرابوون کولانە و قەفەزی سەگەکانن، لە هەموو ژیانمدا بەو ژمارە زۆرە ئەسپی مردووم نەبینیبوو، لە هیچ فلیمێکدا، لە هیچ ڕۆمانێکدا... لە هیچ شوێن و وڵاتێکدا... دڵتەنگ و نیگەران لە شوفێرەکەم پرسی:

«**کاکی شوفێر ئەو هەموو ئەسپانە بەچی مردوون؟**»

کابرا وەک ئەوەی پرسیارەکەی منی بەلاوە سەیربێ تۆزێک ڕاما و لەناو خامۆشی سەرنشینەکاندا دەنگی لە گوێمدا دەزرنگایەوە، من تا ئەو حەلە، لێرە و لەوێ، لە قۆناغی دوور و نزیکدا کەلاکی ئەسپەکانم دەبینی و ژان

دەچووە دڵمەوە... دواجار بەتەوسەوە وتی:

**«ئەسپ نامرێ مامۆستا... ئەسپ دەتۆپێ... بۆ جەوابی سوعالەکەشت کەس نازانێ ئەم دەردە ئەسپە چییە لەو وڵاتەی مە بڵاوبوویتەوە!»**.

هەر ئەوەندە و ئیدی سەرنشینەکانی ناو ماشێنەکە لەناو خۆیاندا کەوتنە دەمەتەقێ و غەڵبەغەڵب... کاکی خۆم لە چ زەمان و سەردەمێکدا شتی وا بووە... هەر هەمووی غەزەبی خودایە، ئەوە نیشانەیە و نۆرە دێتە سەر ئێمەش... ئەوەندە شتی سەیر و سەمەرە ڕوودەدەن کە دەلیلە ئاخر زەمان نزیک بوویتەوە... ئەمن بیستیتم بەدەم بای غارەوە هەر چوار پەلی ئەسپەکان دەشکێن و... سەر سمدان و دەم بەیەک دادانیان یەکێکە، گوایە یەکەم جار کوێراییان دادێ و هیچ نابینن، نا... برا دەردەکە لەوە قورسترە کەس بزانێ لە چاوان دەبن یان لە گوێیان... قوربان لە ئاواییەکەی ئێمەدا چەمێکمان هەیە و لەوەتەی ئێمە هەین و لە باووباپیرانەوە کەس نەیبیستووە کرم لە ماسی بدات، کرم... بەڵێ کرم ئەمساڵ هەر هەموو ماسییەکانی ناو ئەو چەمەی کوشت... نەعوزوبیللا... ئیدی تا دەهات غەڵبەغەڵبەکە هەر لە هیچەوە دەبوو بەشەڕە قسە و نەدەبڕایەوە، من لە خەیاڵی خۆمدا نقوم بووم و دابڕام، تاکە شتێک کە دەمدی و دەیتاساندم مەرگی ئەو هەموو ئەسپە بوو، بەبەرچاومەوە، دەیەها ڕەوە ئەسپم دەبینی کە چۆن بەیەکەوە چوار پەلیان دەشکێ و سەرسم دەدەن و لمۆزیان لە خۆڵ و بەردەڵان دەچەقێ، پەلەم بوو بگەمە لای ئەو پێچەی کە لە خەرەندەکەی نزیک دەخستمەوە، دەمویست هەتا زووە دابەزم، بەکابرای شوفێرم وت کە لە هەورازەکە و لەدوا پێچی جادەکە دامبەزێنێ، بەمیهری برایەکەوە پێی وتم کە دەکرێ میوان بم... سوپاسم کرد، جانتا سووکەڵەکەم دا بەشانمدا و خوداحافیزیم لێ کردن، دیاربوو بەسەرسامییەوە ئاوڕیان لێ دەدامەوە، پێیان سەیر بوو کە لە جادەکە لام داوە و ڕووەو خەرەندەکە مل دەنێم، بەهەنگاوی سست بەناو بەردەڵان و کەرتە شاخەکاندا بەپێچ و لوول ڕێم دەکرد، دەمێک بوو بەناو خاکێکی وا بەردەڵاندا ڕێم نەکردبوو، زوو زوو





لاسەنگ دەبووم و خۆم دەخیلی کەڤرەکان دەکرد، نەرمە نەرمە دەمارە گرژەکانی هەردوو بەلەکم خاو دەبوونەوە و پاشان خوێنیان تێ دەڕژا، تا لە خەرەندەکە نزیک دەبوومەوە سام دایدەگرتم و وام مەزەندە دەکرد کە لە سیحر و ئەفسوونێک نزیک دەکەومەوە، لە خەونەکانی منداڵی کە لێرە و لەسەر ئەم خەرەندەدا بینیمن، بەرد بەبەردیم دەناسییەوە، دەوەن بەدەوەن، درەخت بەدرەخت، ڕەوەز بەڕەوەز... دار هەنارە زڕەکان، بەر لەوەی بگەمە سەر لێواری ڕکی خەرەندەکە دەبوو باخی دار هەنارە زڕەکان تێپەڕێنم، خەرەندێک کە هەزار خولیا و ترس و ئەفسوون و خەون و ختوورەی لە خەیاڵی منداڵانەی مندا دەتەقاندەوە، ئەو شوێنەی کە لەگەڵ (شیرین) و منداڵەکانی دیکەدا گەمەمان لێ دەکرد، لە دوای موتاڵا و وەڕس بوون لە هەڵدانەوەی لاپەڕە هەڵوەشاوەکانی کوردی و حیساب و زانیاری دەکەوتینە دڕاندنی لاپەڕەی دەفتەرەکانمان و دروستکردنی (قوش کاغەز) و هەڵدانیان بۆ ئاسمانی سەر خەرەندەکە، هەر هەموومان بەیەکەوە قوش کاغەزەکانمان بۆ حەوا هەڵدەدا، دەکەوتنە سەر لەپی (با) و هێدی و نەرمە نەرمە ڕووەو قووڵایی خەرەندەکە تاوێک بەرز و تاوێک نزم، بەپێچ و لوول لە ئێمە دوور دەکەوتنەوە، هەندێکیان تا ناو چەمەکە دەگەیشتن، بەر لەوەی بگەنە ناو چەمەکە لە مەودای چاوانمان بزر دەبوون، هەندێکیان بەسەر درەختەکانی قەد پاڵەکانەوە دەگیرسانەوە، هەمیشە ناوی خۆمان لەسەر قوش کاغەزەکان دەنووسی، دڵی هەر یەک لە منداڵەکان لەگەڵ ناوەکانی خۆمان دەفڕی، منالانی هەراشتر دەیەها کۆلارەی ڕەنگاوڕەنگیان دروست دەکرد و تا دەزووەکان دەپچڕان کۆلارەکانیان بەرز و بەرزتر دەدایە دەست هەوا... چەندە دڵمان بەوە خۆش دەبوو کە سەرمان لە مەلەکانی سەر خەرەند دەشێواند، لەناکاو لە قوش کاغەز و کۆلارەکان نزیک دەبوونەوە و تیژڕەو خۆیان لادەدا، من هەر لەسەر ئەو خەرەندە مەڕ و بزنەکانم دەلەوەڕاند، ساڵ دوانزەی مانگ چاکترین بژوێن و لەوەڕگا بوو.

هاتمەوە، بەو نیازەی هەر لێرە، لەسەر ئەم خەرەندە کەلاوەیەک بکرم،

ئەمەیان خەونی دەمێک سالّم بوو، وام هەست دەکرد من بۆ دواجار بەر لەوەی زۆر پیر بم و بمرم لەدوا ساڵەکانی تەمەنمدا لەسەر ئەو خەرەندە بژیم... بەدڵی پیاوێکی نەخۆش و ماندووەوە ڕێم دەکرد، تا لە گەڕەکە کۆنەکەی خۆمان نزیکتر دەبوومەوە پتر دەتاسام و دڵم پەلەپەل لێی دەدا، لێرە و لەوێ ژمارەیەک خانووی دارماوم بینی، چەندین کەلاوەی شان شکاو کە بەحاڵ بەپێوە وەستابوون، دەیەها خانووی دیکە کە هێشتا تۆکمە و بەپێوە وەستاو بوون، لەو ساتە وەختەدا کەسێکم لێ دیار نەبوو لێی بپرسم: ئەرێ شوێنەواری حەسارەکەی (مام پڵنگ) وا لە کوێ؟ ماوە یان ڕماوە؟ دواجار بەپرس و سۆراغی پیرەمێردێکی کەنەفت کە لەسەر سەکۆی بەرماڵەکەی خۆیان دانیشتبوو، توانیم بچمەوە سەر شوێنەواری بەسەر یەکدی دارماوی حەسارەکەمان، دەنێو دار و پەردووی بەسەر یەکدیدا ڕووخاو ساتمەم دەکرد، هەر دەت وت ئەوەیان حەسارێکی دارووخاو نییە، بەڵکو ڕۆحە کاول بووەکەی خۆمە و گەرد بەگەرد لێی ورد دەبمەوە، بیرم لەو ڕۆژگارە زۆر دوور و دێرینە دەکردەوە کە پتر لە خەونێکی پڕ تەمومژ و جەنجاڵ دەچوو، خەونێک کە زۆر بەزەحمەت و هێدی هێدی ڕووداوەکانیت بکەوێتەوە یاد... حەسارێک کە دوای سەرهەڵگرتنی من و مەرگی باوک و دایکم؛ براکانم، بێ پرسی من، وەک میراتێک بەپەلە فرۆشتبوویان، بێ ئەوەی بەشی خوشکە کلۆڵەکانمی لێ بدەن.

چەندین پایتەختی قەڵەباڵغی دونیا، چەندین شار و گوندی ڕازاوە و جوان، چەندین باڵخانەی زۆر خۆش و هەڵواسراو بەئاسمانەوە ئەو حەسارەی لەبیر من نەبردەوە. سەدەها شاخ و کێو و دەربەند، گرد و تەلان و لێرەوار، چیاکانی ئەلب، هیمالایا، ڕووباری دانوب، تایمز، راین... ئەو خەرەندە و ئاسمان و ئاوەی لە خەیاڵی من دەرنەکرد، دەیەها کچی قەشەنگ و شەکرە ژنی خوڵقاو لە شلیک و شیر نەیانتوانی شێوەی شیرینی (شیرین)م لە زەیندا کوێر بکەنەوە، من مەبەستم نییە چیرۆکی کۆچ و سەرهەڵگرتنی خۆم بۆ ئێوە بگێڕمەوە، من هاتوومەتەوە سەیری ئەو





قوتابخانە کۆن و نیمچە دارماوە بکەم کە ساڵانێک تیایدا قوتابی بووم و (خشتەی لێکدان)م هەر پێ لەبەر نەکرا، من هاتمەوە تاوەکو حەسارە تۆکمە و دامەزراوەکەی جاران ببینمەوە، حەسارێک گومانم هەبوو بەفر و باران و هەتاو دایبرزێنن، حەسارێکی بنیات نراو لە بەردی شاخان، گومانم هەبوو بوومەلەرزەش لێی بدا برمێ، کەچی ئەوەی بینیم بەتەنها بناغەی هەڵتەکیوی حەسارەکەبوو کە لە هەندێ شوێن بستێک و لە هەندێ شوێنی دیکە دوو بست لە زەوییەکە بەرز ببۆوە، لە گەڕانمدا بەناو ژوورە دارماوەکاندا دەمویست بزانم من لە کوێ بووم، دیوەخانەکەی باوکم، ژووری تاریک و بێ پەنجەرەی خوشکەکانم، هۆدەکەی نەنکم، هی براکانم، دەمویست شوێنی کادین و گەنجینە و تەویلەکە و ئاودەستخانەکە بدۆزمەوە، ئەو ژێر زەمینەی خاک و خۆڵ و دار و پەردووی بەسەریەکدیدا ڕماو پڕی کردبۆوە، ئەو شوێنە زۆر تاریکەی کە کارەبا دەکوژایەوە دوو فانۆس ڕووناکی نەدەکردەوە، کەچی زولەیخا-ی پلکم لەوێ دەنووست و دەیخوارد، من تا ئێستا نەمزانی بۆ تا مرد شووی نەکرد، بەدوای دار هەنجیرەکەدا دەگەڕام کە بەتەنها دوو بست لە قەدی بڕاوی لە زەوییەکەوە هەڵتۆقیبوو، بەشەرم و ترسەوە لە نزیک ڕەگەکەیەوە چرۆیەکی تازەی دەرکردبوو، گەرەکی بوو وەک یادگارەکانی من سەرلەنوێ دەنێو حەسارێکی وا خاپووردا سەوز بێتەوە و پێم بڵێ: ڕۆژانێک تۆ و خوشک و براکانت گوریستان لە من دەبەست و لەژێر سێبەری گەڵا پان و میهرەبانەکانی مندا جۆلانەتان دەکرد، تۆ بۆ دۆزینەوەی هێلکەیەکی ناو هێلانەکەی باوەشم ملی خۆت دەشکاند، هەر لەژێر سێبەری مندا باوکت پاش نیوەڕوانی هاوین و بەهار سەرخەوێکی دەشکاند و مەلەکانیش نەیاندەوێرا بجریوێنن، هەر لێرە بوو نەنکت تەشی دەڕست و دایکەش بەدەم خەمێکی هەمیشە و پەنهانەوە دەگریا... دەمزانی لە هەنجیرەکەوە بە دە هەنگاو دەگەمە گەنجینەکە، دە هەنگاوی وردی ئەوسا، بە بیست هەنگاویش دەگەمە کادینەکە، بە سی هەنگاویش ڕووەو ڕۆژهەڵات دەگەمە سەر تەنوورەکە، بە چل هەنگاو

ڕووەو ڕۆژئاوا تەویلەکـەیە، ئەو تەویلەیەی خـۆشـتـرین ڕۆژانی من و بزنەشێـتی وەیاد دەهێنامـەوە و دەیگریاندم، بەڵام من هەنـووکـە هەنگاوم گەورەتر بووە و هیچ ئاسەوارێکی گەنجینە و تەویلە و تەنوورەکەش نابینم، هەر دەڵێی ئەو ژیانەی من دەنێو ئەم حەسارەدا جگە لە خەون و تراویلکە، جگە لە درۆیەک هیـچی دیکە نەبووە... تلـیش و پارچەداری قـەڵاشکەر، جلی دڕاو، عـەرەبانەی شکاو، دار و پەردووی بەسـەر یەکـدیدا ڕمـاو، بنمـێـچی تەپیـو، دار و پەردووی پەرشـوبڵاو تا ناو ڕەزەکـان هاتبـوون، دونیایەکی وێران و خاپوور، نەمدەزانی وەئاگام یاخود لە خەودام، تەنها شتێک کە نەگۆڕابوو خۆر و ئاسمان و ئەو (با)یە بوو کە لەگەڵ هەڵکردنی لق و پۆپی درەختەکانی دەشنانەوە، نا... هەرگیز ئەو مەل و مرۆڤ و ئاژەڵ و درەخت و خانووانە هەمان ئەو شتانە نەبوون کە من لە خەونەکانما سەدەها جـار وەکـو خـۆیان دەمـبـینینەوە، داتەپینی خـانوو و باڵەخـانەیەکی زۆر، شکانی دەیەها درەخت لەناو قـەدەوە، شکانی لق و پۆپی ئەوانی تر و نیشتنی تۆزێکی ئەستوور لەسەر گەڵاکان، پەرتبوونی ئەو هەمـوو سۆل و پێڵاوە کۆن و داڕزیوە، جێمـانی ئەو هەمـوو گـاسنە ژەنگدار و ئافەرۆزە و پەنچەربوونی ئەو هەمـوو تراکتۆرانە و پەککەوتن و مـانەوەیان بۆ ماوەیەکی درێژخـایەن لەژێر بـاران و هەتاو... ڕەنگ بـواردوو... داڕزابوون، ئەو هەمـوو سەگە بەڕەڵڵایانەی گەڕ ببوون و بەزەحمەتێکی زۆرەوە بەم و بەو دەوەڕین، ئەو هەموو مەلە مردووانەی کە مێش و مەگەز و مێروولە تێیان وروکابوون، سووڕانەوەی بەردەوامی هەڵۆکانی سەر خەرەند و نزم فڕینی قەلەڕەشەکان دەیترساندم... قاغ قاغ... بەدەم ڕێوە، لێرە و لەوێ، ساتمەم لە کەللەسەری مەڕ و بزن و ئەسپ و هێستر دەکرد، هەوایەکی بۆگەن لەناو ئەو گیا و گۆڵە هەڵدەسـتـا و کـاس و حـۆلی دەکـردم، هەر دوای چەند چرکـەیەک و ئیـدی هەستم دەکرد ئەو بۆنە ناخۆشە لە گیانی من هەڵدەستێ، وام دەزانی منم و بۆگـەنم کـردووە، چەندە لەو وێرانە و کـاولـکـارییـە دەچـوو کـە لە هەندێ لە حەکـایەتەکـانی نەنکمـدا پاڵەوانەکـان کـتـوپڕ خۆیان لەنـاودا دەبینییـەوە...





بۆنی خوێن... پێستـەی غـاراو... میوەی گەنیو، بەچواردەوری حەسارەکەدا پیـاسـەم دەکـرد و لێـرە و لەوێ ئەو مـەردوومـانەم دەبینی کـە هیـچ سـۆز و بەزەیی و خـۆشـەویسـتی و شکۆ بەچاویانەوە دیار نەبوو، زۆر ترسنۆک و خـۆپەرست و غـەمـبـار لەژێر کـەچە جلەکـانیـاندا دەهاتن و دەچوون، یەکـەم جـارم بوو بزانم کـە ئەگـەر مـرۆڤ وێران و مـاندووبێ و لەناو کـەلاوەدا بژی مەحاڵە بتوانێ میـهرەبان و جوان و ناسک بێ، من بۆ ئەو خەڵکە پاک و جگەرسـۆزەی زەمـانێکی زووتر لە ئێـسـتـادا دەگـەڕام، بەردەمی هەر خـانوویەکی داڕووخـاو و نیـمـچە بەپێـوە وەسـتـاو زبڵاخە بوو، سـەگ و پشیلەکان لە برسانا تەنەکەی زبڵەکـانیـان بەگۆڕێ وەرکردبوو، چەندین دار عـەلەتریک لار ببـوونەوە و سـاتمەم لە وایەرە پچـڕاوەکـانیـان دەکـرد و لە قاچەکانم دەئاڵان، ئەوانەشی کە بەپێوە مابوون گڵۆپەکانیـان شکابوون، لە جێی خانووە داڕووخاوەکان چەندین ڕەشماڵی کۆن و هەلاهەلام بینی کە لە دە لاوە پینە کـرابوون، یەکـەم جـارم بوو ئەو هەمـوو منـاڵە زۆرە ببینم کـە تا کـونی چاویان لە قوڕ چەقـیبوون و وەک گـەورەکان مڕومۆچ و داخدار بوون، شەکەت و مـاندوو، تەنیا و بێ دەستەڵات دەگەڕام و دەمـویست بپرسم ئاخۆ ئەم کـاولکارییـە خـەراباتی پاش بوومـەلەرزەیە یان چی... کـەس نەبـوو لێی بپـرسم... کـەس ئەو ڕووەی نەدامێ، ناچار گـەڕامـەوە ناو کـۆنە حـەسـارە داڕماوەکەی خۆمان، نەمدەزانی ئەو هەمـوو پەڕۆوپاتاڵ و کەلوپەلە داڕزیوە چییە کە لەو ناوە کەوتبوون، کەستەک و بەردی گەورۆنە، کۆنە بێژنگێکی شکـاو، پێـمـەڕە و خـاکـەناسـێک کـە دەسکەکـانیـان گـردەبڕ شکابوون، دەمویست تارمایی ئەو منداڵە ونبووە بدۆزمەوە کە لە خۆم بزر ببوو، هەر ئەو ڕۆژە لێم بزر بوو کە بەنەخۆشی منیان خستە باوەشی نەنکم و سواری هێستریکیـان کردین و لەگەڵ کاروانێکدا ڕووەو کوێستان، لەناو تەمێکدا بزرم کرد: لە گەڕانم بەناو شارە زۆر جەنجاڵەکانی دونیادا هەر بەدوای ئەو منداڵە ونبووەدا دەگەڕام، بایەک هەڵی کرد و منی گەڕاندەوە ئەو بەیانی و ئێوارانەی لە شاخەکانەوە شنەیەکی پاک و بۆنخۆش حەوشە و ژوورەکانی

پڕ دەکرد لە بۆنی گیاوگوڵی کوێستانان، هەمیشە بۆنی هەوای بەیانیان جیابوو لە ئێواران... شەوانیش بەبۆنی ڕەشەڕەیحانە مەست دەبووم، ئەو بۆنەی لە سینە و بەرۆکی زولەیخای پوورم دەهاتە دەرێ کە تاکە شتێکی زیندوو بوو لەگەڵ خۆی دەیبردە ژێر زەمینەکە، لە بۆنی باوکە دەگەڕام؛ بۆنێک کە بۆ هەمیشە پێی نامۆ بووم، لە بۆنی دایکە دەگەڕام کە هەمیشە بۆنی قەرەنفول لە گوند و شارەکانی دونیادا ئەوی بیر دەهێنامەوە، لە هەناسەبڕکێ و قسە پچڕ پچڕەکانی نەنکم دەگەڕام کە بەدەم حەکایەتەکانی عیشقەوە لە دەورم بڵاودەبۆوە و دەیخستمە ناو تانوپۆی چیرۆکەکانی، بۆنی برا سپلە و دڵڕەقەکانم، خوشکە زۆر شەرمنەکانم، بۆنی پوورەکانم کە ساڵ دوانزەی مانگ بۆنی گیابەند و پونگ و نەعناعیان لێ دەهات... بۆنی کانی سارد، ڕەنگی گڕ لە دەمی تەنوورەکەوە و قرچە قرچی سووتانی خێرای چڵ و چێو، چوومەوە سەر بیرەکە کە ئەوەندە زبڵی تێ ڕژابوو پڕ ببۆوە، هەموو جارێک سەرم بەسەر زارکی بیرەکەدا شۆڕ دەکردەوە و گوێم لە چرپە چرپ و قریوەی تێکەڵ دەبوو کە لە گوێمدا دەزرنگایەوە، دایکە دەی وت: ماڵی جنۆکان وا لەوێ، هەمیشە دەولکەکەم شۆڕ دەکردەوە و ئاوم هەڵدێنجا بەو ئومێدەی ڕۆژێکیان بێچووە جنۆکەیەک لەناو دەولکەکە بدۆزمەوە، بیکەم بەخوشکی خۆم گەر مێیینە بوو، بەبرا گەر نێرینە بوو، باوکە هەمیشە هەڕەشەی ئەوەی لێ دەکردم گەر کەللەیی و تووڕەبێ لێم سەرەونخون هەڵمدەداتە ناو بیرەکە، ئەو هەمیشە لە هیچە کەللەیی دەبوو، من هەمیشە بەغیلیم بەوردە جنۆکەکانی ناو بیرەکە دەبرد، وام هەست دەکرد کە ئەوان زادەی ئاون و لە من بەختەوەرترن، هەر بەمەزندە چوومەوە سەر خاکی تەویلەی ڕماو، لە پاشماوەی قشپل دەگەڕام، لە خۆشترین ولاتانی دونیا دەچوومە گوندە دوورەکان و دەکەوتمە دوای مەڕ و بزنەکان تاوەکو بۆنی پشقل بکەم کە من پڕ بەدڵ ئارەزووم دەکرد، بۆنی قەرسەقول، بۆنی خوری مەڕ و تیسکی بزن و ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار باران لێی دەدا، لەو گەڕانەمدا ئەو بۆنە کتوپڕ کەللەمی پڕ کرد و لە ڕۆحمدا





غوربەتێکی قووڵ دەیگریاندم و دەیبردمەوە ئەو ڕۆژانەی کە شوانێکی زۆر چکۆلە بووم، وەک کەسێک بەدەم خەوەوە ڕێ بکات و ساتمە لە داروبەرد بکات بێ ئەوەی لەپەو ڕوو بکەوێ هەر هەموو کووچە و کۆڵانەکانم پشکنی، هەر لە خۆمەوە بەکەمێک ترس و شەرم و گومانەوە دەستم هەڵدەبڕی و سڵاوم لەو خەڵکە دەکرد کە لەوە دەچوو تازە وەک من هاتبنەوە و کەلاوە و خانووە ڕماوەکانیان بخەنەوە سەرپێ، بەدەم نووشتانەوە و هەستانەوە، پاچ وەشاندن، قوڕگرتنەوە، ئارەقە سڕینەوە، بەدەم کوفر و جوێنەوە، سکاڵا و گلەیی، نەفرەت کردن لە شەیتان... بەدەم هیلاکی ڕاکێش ڕاکێشی حەسیر و کاریتە و شەقڵەوە زۆر گران دەجووڵان و گرانتر وەڵامی سڵاوی شەرمنانەی منیان دەدایەوە، لە سەروسیمام، لە جلوبەرگم، لە پێڵاوەکانم ڕادەمان، دەیانزانی من جگە لە غەریبەیەک هیچی دیکە نیم، دڵنیابووم کەس ڕۆحی بریندار و کلۆڵم نابینێ، ڕۆحی منداڵێک کە بەر لەوەی ئێرە ببێ بەدار و پەردووی بەسەریەکدیدا ڕماو لەم ئاسمانە تەرە بوو، ڕۆحی شوانێک کە لەگەڵ هەڵدێرانی بزنە خۆشەویستەکەی بۆ ناو ئەو خەرەندە؛ ڕۆحی منیش هەپروون بەهەپروون بوو، ڕۆحی قوتابییەکی ترسنۆک و شەرمن کە بەر لەوەی گەورە بێ و لە داستانە مەزنەکانی عیشق و لێک دابڕان تێ بگات ئەم لە (شیرین) دابڕا... خودا هاوار هەر دەت وت بوومەلەرزەیەک لەو شارۆچکەیەی داوە و خاپووری کردووە، هەر کەسە و بەپەلەپەل دەیەوێ کەلاوە ڕماوەکەی خۆی بخاتەوە سەرپێ، من هاتبوومەوە ناو ئەو وێرانەیە تا بگەڕێمەوە بۆ ئەو بەیانییەی من بۆ یەکجاری ئەو حەسارەم بەجێ هێشت، لە باوەشی نەنکمدا بەجووتە سواری هێسترێکیان کردین و ڕووەو کوێستان بەرێیان کردین، ئیدی من خەونم بوو بۆ جارێکی دیکە بگەڕێمەوە سەر ئەو خەرەندە کە بەقەد ڕۆحی من قووڵ و ترسناک و پەنهان دەنوێنێ، بگەڕێمەوە ناو حەسارێک تۆکمە و بەپێوە وەستاو، کەچی لە ڕۆحی پەژمووردە و غەریبی من کاولتر... گەلێ گەلێ خاپوورتر، دوای ئەو هەموو ساڵانە کۆڵانەکان

دڵڕەقانە خیانەتیان لێ کردم، هیچ کۆڵانێک ئەوەندە فراوان و میهرەبان نەبوو دەستم بگرێ و بمباتەوە بەر شاتووەکە... بەر دەرگای ماڵی (شیرین)، ئەو دەرگا دارینەی هەمیشە سەرسامی دەکردم بەوێنەی دوو تاوسی هەڵکۆڵراو لە دامێنەکەی، ڕامانم بەدیار ئەو دوو تاوسەوە جوانترین و مناڵانەترین بیانوو بوو بۆ ئەوەی لەبەر ئەو دەرگایە بوەستم و شیرین دەربکەوێ، دەمویست بگەڕێمەوە ئەو بەیانییەی بەدەم ڕێوە، بەسەر هێستری چەمووشەوە، بۆ شیرین دەگەڕام و نەمدەبینی... یەکەمین ئەوینی من... نا من لەوە گێلتر بووم ئەوین بفامم و تێی بگەم، یەکەمین سۆزی من... یان گیرۆدەبوون... هۆگری و ئولفەتێک... یان چی...؟ نازانم... نا من گومان لە خۆم دەکەم... بەڵام بۆ بەتەنها لەو گەڕەکەدا: لەو قوتابخانەیەدا... لەو شارۆچکەیەدا من بەتەنها دڵم بەو خۆش بوو... بۆچ بەتەنها شەرمم لەو دەکرد و کە دەردەکەوت هەموو گیانم دەلەرزی، لەو بەیانییە زۆر زووەدا هەروەک دوو عاشقی چکۆڵە و گوناهبار لێکیان کردین، لە باوەشی ئەو دەریان هێنام و... وەک هەر عاشقێکی نائومێد و دڵسارد لەناو پێخەفدا کەوتم، گەرمیان و کوێستانیان پێ کردم، چەندین داوودەرمان و حەکیم، چەندین جار لەگەڵ گریان و داد و فیغانی نەنکم و دایکم و خوشکەکانم و پوورەکانم لە مەرگ وەئاگا دەهاتم... هەموو جارێکیش کە چاوم دەکردەوە (شیرین)م نەدەدی دەبوورامەوە... لە داخانا هەناسەم لە خۆم دەبڕی و خۆم دەکرد بەمردوو... ئاخ من چەندە تاسەی ئەوم دەکرد... چەندە نەخۆشی بینینی ئەو بووم... کەسیش نەیدەزانی... هیچ کەس...

چەندە سەیرە دوای سالانێکی زۆر بگەڕێیتەوە تا بزانیت ئاخۆ خەیاڵێکی کۆنی خۆت، خەونێکی بابردوو، حەزێکی زۆر دێرینت... سۆزێکت لە کوێ دۆڕاندووە و چی بەسەر هاتووە؟ بەنێو کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا دەگەڕام و ساتمەم لە داروبەرد دەکرد، لە دەرگایەکی نەخشەدار بەدوو تاوسی پەڕوباڵ کراوە دەگەڕام... بۆ شاتوویەکی پیر لە بەردەمی دەرگاکە... زۆر گەڕام... نە دەرگاکەم دۆزییەوە و نە شاتووە





زەبەللاحەکە کە من وام مەزەندە دەکرد گەورەترین شاتووی دونیا بێ، زۆربەی نیوەڕوانی هاوین شیرین جامێک شاتووی دەدامێ تا من دەست و دەم و لێوی خۆم لە خوێناوی شاتوودا سوور بکەم و ئەویش قاقا پێبکەنێ و خۆشی لەوە بێ کە من نەوسنترین مناڵی گەڕەکم... نا... وا نەبوو... من خۆم ئەوەندە چلێس نەبووم؛ بەس من نەک خوێنی شاتوو... من ئامادەبووم خۆم لە قوڕ هەڵبکێشم تا ئەو خەنی بێ...

مەحاڵ بوو بچمەوە سەر ماڵەکەیان، نەشمدەزانی لەوە تێ بگەم کە شاتوویەک بەو قەدە ئەستوورەوە، بەو هەموو ڕەگ و ڕیشاڵەوە کە دەیان وت چۆتەوە سەر خەرەندەکەش... چۆن چۆنی هەڵتەکیوە؟ تۆ بڵێی هەر هەموو ئەو چیرۆکەی من خەونێکی پڕ لە خۆشی و ناخۆشی خۆم بێ، خەیاڵێکی درۆ کە دووری چەندین ساڵ لە خەڵک و خاک پێی خولقاندبم، من ئەوساش، لەو تەمەنەدا، بەو ساڵە کەمانەوە دەمزانی لە هەر کۆڵانێکدا ستوونێکی کورتەباڵا و درەوشاوە و نوورانی ببینم، ستوونێک لە هەتاو و سێبەری شینباو کە هێدی هێدی دەبوو بەرەنگامە... ئیدی دەمزانی شیرین وا لەوێیە و گەمان دەکات، هەر ئەوسا کە لەگەڵ نەنکم بەسەر هێسترەکەوە دەلەنگینەوە تەمێک داکشا و بەسەر هەموو شاخەکان و خەرەند و ماڵەکانی ئێمەدا، لەو بەیانییەدا لێ نەدەگەڕا ئەو ستوونی نوورە، شەبەنگی ڕەنگاوڕەنگی ئەو کچی هەتاوە ببینم، بریسکەی چاوانی کە وەک دوو گەوهەری ڕەش دەدرەوشانەوە، دوو چاوی ڕەش دەلیلم بوون تا لەو کچی هەتاوە نزیک ببمەوە و دڵنیابم لەوەی ئەو بوونەوەرە چکۆڵەیە شیرین-ی هاوپۆلە... بەشەرمی مناڵێکی سواڵکەرەوە پێم دەوت:

«**چۆنیت؟**»

لەو ڕۆحە ڕووناکەوە زرنگانەوەیەک لە ترس و شەرم هەوای چواردەورمی دەخستە سەر گێژەلووکە، ترس و شەرمێک لەو ڕۆح لەبەرە زۆر تەنکەوە شپرزەی دەکردم و دەی وت:

«**وی... فەرهاد... بڕۆ بەولاوە... دایکە دەڵێ لە کوڕان نزیک نەبیتەوە!**».

بەڵام هەر زوو ئامۆژگاری پووچ و بێ مانای دایکەی لە یاد دەکرد و... دەستەکانی دەگرتم و ڕووەو باخی دارهەنارە زڕەکان ڕای دەکێشام، ساتمەمان لە داروبەرد دەکرد، دەکەوتین و بەدەم قاقا و قریوەوە هەڵدەستاینەوە، قریوەی دوو منالٚ کە لەگەڵ جریوەی مەلەکانی سەر خەرەند تێکەڵ دەبوو... دەنگی دەدایەوە... بەخۆشی و سەرسامی و ترسەوە ڕووەو خەرەندەکە ڕووم وەردەگێڕا و هەردوو دەستم دەکرد بەشوورەی دەمم و هاوارم دەکرد:

**«شیرین... هۆ هۆ شیرین»**

بەهەمان سەدا و سیحرەوە دەنگێک ناسکتر لە خوڕەی چەمەکەی ناو خەرەندەکە بەئاسماندا پەرت و بلاو دەبۆوە و دڵمی دەخستە سەر لەرزەلەرزی ترس و تاسە...

**«هۆ... فەرهاد... هۆ... هۆوو... واو... واو واو...!»**

من هیچم نەدەویست جگە لە گەمەکردن لەگەڵ ئەو پەرییە بچکۆلەیەی کە لەوە دەچوو لەناو یەکێک لە حەکایەتەکانی نەنکمدا باڵەکانی لەیاد چووبێ و جێی هێشتبێ، گەمەکردن بەخۆڵ یان بەموروو، جۆلانێی ژێر شاتووەکەی بەردەمی ماڵیان بێ یان غارغارێنی ناو دار هەنارە زڕەکان، یان پێ ئەزبەرکردنی سروودەکان بێ یان خشتەی لێکدان، هەمیشە ستوونێک لە ڕۆحی ڕۆشنی بەشەوارەی دەخستم و لە خۆیەوەی وەردەپێچام، برژانگەکانی ئەوەندە ئەستوور بوون کە دەکرا بیانژمێرم، لووتی قنجی کە کەمێک بەرز هەڵشاخابوو، لە کچێکی چکۆڵەوە دەیکرد بەشازادەیەکی پڕ فیزوناز، دوو کولمی هەمیشە داگیرساو، ڕوومەتی مەیلەو سپی تێکەڵ بەکازیوەی بەیانیان، هەردوو گوێی وردی، بۆنی خۆشی کە بەلامدا تێدەپەڕی و سەرمەستی دەکردم، لاڵ و وڕوکاس چاوەکانم بەدوایەوە بوون، لە کراسە گوڵ گوڵییەکەی ڕادەمام، ڕەنگرێژ بەشەبەنگی خۆرەتاو، وای لەو لەشە نەرم و نۆڵەی، بۆنی کچانەی کە جیابوو لە بۆنی نەنکم و دایکم و پوورەکانم، دەنگی پڕ لە زرنگانەوەی،





وای لە زمان گیران و تەریق بوونەوەی، هەردوو ئەبرۆی پەیوەستی، پێڵووەکانی کە هەر دەت وت باڵی چۆلەکەیە و لێکیان دەنێ، دوو دەستی چکۆڵەی کە لەوە نەدەچوو پەنجەکانی ئێسقانیان تیا بووبێ، تەوێڵی شەمزاوی بەهەتاوی خودا، پەرچەمی پەرێشانی، هەردوو شانی چکۆڵە و داکەوتوو لەژێر قورسایی جانتای لە پەڕۆ دووراوی پڕ لە کتێب و دەفتەر، خەندە و شاگەشکەبوونی هەمیشە ئامادەی، ترپەی دڵی هەمیشە ترساوی ئەو کاتەی لەگەڵما دەیوێرا بێتە ناو ئەشکەوتی -دێوان- و گوڵەکان بۆن بکا و بەئاونگی کەوتووی سەر گیاوگۆڵ دەموچاوی تەڕ بکات، لە ترسی فرکەی باڵی مەلێک کە هەوای ئەشکەوت و دڵی ئێمەی دەلەرزاند شیرین خۆی فڕێ دەدایە باوەشم و خۆی بەمنەوە دەقرساند، وەها توند و کەمەرگیر، کە وام هەست دەکرد دڵی لەرزیوی لەناو سینەی مندا کوتەکوت لێ دەدا و دڵی منیش وا دەنێو سینە و پەراسووە ناسکەکانی ئەودا، ئەوەیان تەنها وەختێک بوو کە بێ باکانە بوێرم دەموچاوم لەنێو قژی پڕ و پەرشوبلاوی شیریندا حەشار بدەم، لەگەڵ تاریکی ئەشکەوتدا چ ئارامگایەک بوون، نەمدەویست لەو تاریکییە بێمە دەرێ، دەنێو کوێربوونی خۆمدا هەمیشە ئەو تارماییە ڕۆشنەم دەبینی کە ڕۆحی جوان و شیرینی ئەوبوو، ڕوویەکی ڕووناک کە دوو مرواری ڕەش لە باقوبریقی خۆیاندا نوالەیەکیان لە دەوری سەریدا ڕەسم دەکرد، لە پڕ دەی وت:

**«تینوومە!»**

فووم لە گۆلاوەکەی ناو ئەشکەوتەکە دەکرد و لە چڵ و چێو و گەرد پاکم دەکردەوە، بەهەردوو دەست گۆلێک ئاوم بۆ ڕادەگرت، ئەویش وەک پشیلەیەکی گوربە زمانی دەردەکێشا و بەر ئاو و پەنجەکانی من دەکەوتن، زمانی تەڕی دەلستەوە، من لەو دیمەنە ڕادەمام خەنی دەبووم، ختووکەم دەهاتێ، چ خۆشبەختییەک بوو کە دەمدی تینوێتی دەشکا و شوکرانەبژێر لە منی کلۆڵ ڕادەما و خەندەیەکی خوار لە گۆشەی لا لێوییەوە دادەکەوت و وەک خوناو دەرژایە ناو گۆلاوەکە و ڕۆحی ئاوەکەی شپرزە دەکرد، لە

تەکما لەسەر بەردێک دادەنیشت و لە دڵۆپە تکاوەکانی زارکی ئەشکەوتەکە ڕادەما و تا ماندوو دەبوو دەیژماردن، پاشان زمانی دەردەهێنا تا دڵۆپەکان بتکێنە سەر زمانی، خەنی دەبوو... دەی وت:

**«تامی بەردی لێ دێ»**

کە سەرما پێستی گرژ دەکردین دەهاتینە دەرێ و خۆمان دەدایە بەر تینی نەشئە بەخشی خۆرەتاو، ئیدی گەرم دادەهاتین و دەچووینەوە ژێر سێبەری نارێکی داربەڕووەکان... خودایە هاوار... شیرین چەندە لە پەری ناو حەکایەتەکانی نەنکم دەچوو، ئەو پەرییانەی شەوان بەماچێک خەویان لێ دەکەوت و بەیانیانیش بەماچێک وەئاگا دەهاتن، کە ئاواهی دەمدی، کە دەبوو بەپرتەوێک لە نوور... لێی دوور دەکەوتمەوە، لەژێر سێبەر و تاودا کتومت لەو پەرییە دەچوو کە نەنکم وەسفی دەکرد و بەدرۆ بێ یان ڕاست من هەموو ئەو وەسفە دەگمەن و شیرینانەم دەخستە پاڵ شیرین، هەموو شەوێک لە دوای حەکایەتی «پەرییەکی تۆراو» ئامۆژگاری دەکردم کە ئەگەر پەرییەکی وا هاتە خەونم هەرگیز خۆم نەفام نەکەم و بکەومە دوای، دەیترساندم کە ئەگەر پەرییەکی وا فریوی دام ئیدی جارێکی دیکە من ئەم ماڵە نادۆزمەوە و تا ئەبەدیش دەبمە کۆیلەی پەرییەکی پەڕوباڵ کراو... خوا لێی داخدار و لە بەهەشت دەرکراو، من دەمویست پێی بڵێم:

**«نەنێ گیان... ئەو پەرییەی تۆ وەسفی دەکەیت چەندە لە شیرین-ی دراوسێمان دەچێ!»**

ئەو پتر زەندەقی دەبردم:

**«مناڵ مەبە و مەکەوە دوای... وا مەزانە خەونە و لێی وەئاگادێی... گەر یەکجار بکەویتە دوای تارمایی ئەو پەرییە و فریو بخۆی... ئیدی لە توخمی ئادەمیان دەتۆرێی!»**

وازی لە ترس و تۆقاندنم دەهێنا و بەزەیی و سۆزی دەجوولاندم:

**«تۆ نەنێی خۆت بۆ کێ جێ دێڵێ؟ من ئیدی حەکایەت بۆ کێ بگێڕمەوە، تۆ پیرە باوکت بۆ پەرییەکی نەزان جێ دێڵی، کە دوو ڕۆژ و**





**نیوی ماوە و دەمرێ و ئەو هەموو ماڵ و میراتە بۆ کێ بێ؟ کێ مەڕ و بزن و مانگاکانی بەخێو بکا؟ ئەی خوشکە دڵشکاوەکانت؟ برا خاسەکانت؟ پوورە دڵسۆزەکانت؟ ئەی دایکت... دایکی هەمیشە کلۆڵ و گرینۆکت... خۆ بەو خوای وا لە بانی سەری هەر هەموومان لە دوای تۆ بەسک دەدەین و دەمرین!»**.

ئەو دەیترساندم و کەچی هەموو شەوێک پەرییەک دەهاتە خەونم، منیش دەبووم بەکوڕە کەچەڵی ناو حەکایەتەکانی نەنکم، لە ناکاو پەرییەکە شێوەی شیرینی وەردەگرت و ئیدی من گیرۆدە دەبووم، لەو خەونانەشدا ترسەکانی نەنکم لێ نەدەگەڕا منی بابردەڵە و جیقن لەو پەریزادەیە نزیک ببمەوە و ماچێکی بکەم، خودا نەنکم بگرێ... هەزار جار... لە حەکایەتەکانی ئەودا کە کوڕە کەچەڵ پەریزادەکەی ماچ دەکرد و سەری چاک دەبۆوە و قژی دەهاتەوە، هەر لە دوای ئەو ماچەوە بوو کە ئیدی کوڕە کەچەڵ دەبوو بەپادشای شاری پەرییەکان و جوانترینیانی لە خۆی مارە دەکرد، بەشکۆ و شانازییەوە دەستی لە تاجە چکۆڵەکەی سەر سەری دەدا کە هەر هەمووی گەوهەر ڕێژ... چەندە سەیرە... چەندە لەوە دەچێ من ئێستاکەم درێژکراوەی خەونێک بێ لەو خەونانەی تیایدا تا ئەبەد بزر بووبم، لەوە دەچێ هەر هەمان سزابێ... سزای ئەوەی بەگوێی نەنکم نەکردووە و لە خەونێکمدا کەوتبێتمە دوای پەریزادەیەکی فریودەر، هەر بۆیە هاتوومەتەوە سەر شارۆچکەیەکی وێران... بەناو قوڕدا ڕێ دەکەم و ناگەمە هیچ شوێنێک، نە کەس دەناسم و نە کەس دەمناسی، کوان خوشک و براکانم؟ کوا گۆڕی دایک و باوکم؟ لە کوێ بوو نەنکمان ناشت؟ کوانێ حەساری بەپێوە وەستاوی باوکم؟ کوا شاتووەکەی بەردەمی ماڵی شیرین، دەرگای نەخشەدار بەدوو تاوسی ڕەنگین؟ خۆ من نەکەوتمە دوای پەرییەکی هیچ کام لە خەونەکان، خۆ من نەبووم بەو فەرهادەی ناو حەکایەتەکەی نەنکم؛ فەرهادی سەنگ تاش، فەرهادی کۆکەن... شێت و شەیدای شیرین-ی ئەرمەن... خۆ من لە خەودا نەمدی شێوەی شیرین-ی

*دولبەرێک... کچێکی جوان پەری پەیکەرێک...*
*هات لەگەڵ فەرهاد... بەربوونە یاری*
*بەدڵێکی خۆش... بەکامگاری*
*ئەنگوستیلەی خۆی بەخشی بەفەرهاد*
*فەرهادیش هی خۆی پێ دا... ئەمیش بوو دڵشاد*
*فەرهاد لێی پرسی ئەی پەری ڕەفتار*
*تۆ ناوت چییە... زوو بیڵێ هاوار*
*گوتی: هۆ فەرهاد مەبە دڵ غەمگین*
*ناسراوە ناوم: گیانە بەشیرین*
*ئەگەر نازانی شوێن و مەکانم*
*لە نزیک ئەڵوەن... لە تاقە و سانم*
*لە خەوی شیرین کاتێ کە هەڵسا*
*عەقڵ و شعووری لەسەردا نەما*
*ئەنگوستیلەی شیرین-ی ئەرمەن*
*لە پەنجەی دابوو: فەرهادی کۆکەن...*

بەدەم ڕێوە ئەو شیعرەم هاتەوە یاد، ئەو شەوانەش کە نەنکم تا دەخەوتم وازی نەدەهێنا تا دوو بەیتی تازەی پێ ئەزبەر دەکردم، گەر ئەو شیعرە نارێکە نەبووایە، گەر ئەنگوستیلەکەی نەنکم نەبووایە کە کردبوومە پەنجە تووتەی دەستی چەپم و هەرگیز دڵم نەدەهات بزری بکەم: بڕوام نەدەکرد کە من ژیانێک ژیاوم وەک گرانەتا، ژیانێک کە خۆم تیایدا ون بووم چ جای ئەنگوستیلە، دەیەها کچی شۆخ و شەنگ لەو ڕێی سەفەر و مانەوەیەمدا حەزیان لێ دەکرد و بێ شەرمانە داوایان لێ دەکردم... جوانترین یادگاری نەنکم بوو، هەر کێ دەیدی حەزی لەو نقێمەشینەی دەکرد... هەرگیز دڵم نەدەهات بیبەخشم، بیرمە دەی وت: لە چاو و زار دەتپارێزێ، بیرمە دەی وت: هەر کە دڵتەنگ بوویت... سێ جاران لە پەنجەتا بای دە... خەم و





کەدەر لە دڵت دەردەچێ... بەدەم ڕێوە، بەدەم خۆڵادان لە قوڕوچڵپاوی ناو کۆڵانەکانەوە، زۆر لەسەرخۆ و هێواش سێ جاران ئەنگوستیلەکەم بادا، وەلێ مەحاڵ بوو فرمێسکم پێ ڕابگیرایە... بێ باک لە خەڵکی پیادە و سوار هۆن هۆن دەگریام... حەزم دەکرد ڕێبوارێک بموەستێنێ و بپرسێت:

«**کابرا چی بووە... بۆ دەگریت؟**»

کەس نەبوو...

حەزم دەکرد پیاوێک خاکەناسەکەی فڕێ بدا و لەناو قوڕ بێتە دەرێ و پێم بڵێ:

«**لە کوێوە بۆ کوێ؟**»

کەس نەبوو...

ژنێک ببێ بەخوشکم و بەچرپەوە مێرد یان براکەی لە گریانم ئاگادار بکاتەوە...

کەس نەبوو...

کچێک بوێرێ بەجامە ئاوێک میهر بنوێنێ...

*کەسێک... هەر کەسێک خوڵقی نان و دۆیەکم بکات... کەس نەبوو... دەمدی... هەندێکیان بەدزییەوە توێشەبەرەکەیان دەکردەوە و پاروویان دەگلاند... تەمەنی خۆم دەفرۆشت و خوڵقم بکەن... کەس نەبوو...*

خودا هاوار... ئەنگوستیلە بادانەکەش هەر دادم نادات، چەندە بەدگومانم لەو گەڕانەوەیەم، چەندە تەنیا و ڕسوام، ئەوەندە تەنیا کە ئیدی شەرم لە خۆم بکەم، کەمەکێ بترسێم... زوو زوو ئاوڕی چەپ و ڕاستی خۆم دەدایەوە، بەو قاتەجلە گرانبەهایەی بەرمەوە کە لە شاموای ئەسڵ بوو، بەچاویلکەی چوارچێوە زیوینەوە، بەجووتێک پێڵاوی ئیتاڵییەوە هەر لەو بەگزادەیە دەچووم کە پێشتر سواڵکەر بووبێ، کەچی وەک لە حەکایەتەکانی نەنکمدا ڕوودەدا، کچی پادشا هەر لەبەر بەزەیی و دڵنەرمی خۆی میهر دەنوێنێ و سواڵکەرەکە ماچ دەکا و دەبێ بەبەگزادەیەکی خاوێن، بەڵام نا... دەنێو ئەو وێرانەیەدا من تەریق دەبوومەوە، بەو جلە خاوێنەوە چەندە بێ

باک و پڕ هەواوفیز دەردەکەوتم... چەند گەلۆر و کەمتەرخەم، وەها شەرمم لە خۆم دەکرد کە لە ڕێ ڕۆیشتندا خۆم لە دیوارە نیمچە ڕووخاوەکان دەخشاند، لەناو ئەو دار و پەردووەدا، دەنێو کاولکاری شارۆچکەیەکدا چەندە لە پاشایەکی بێ خەم و دڵڕەق دەچووم کە جگە لە تێڕامان لەو تێکڕمانە هیچی دیکەی پێ ناکرێ، پاشایێک کە بێزی نایەت دەستەکانی خۆی پیس بکات، ئامادە نییە بۆ هەڵگرتنەوەی خشتێک، وەشاندنی پاچێک کەمەکێ بنووشتێتەوە، کەرێکی چوارپەل شکاو لەژێر قورسایی بارەدارێکدا ڕاست بکاتەوە سەر پێیان، لە شکۆی خۆی بێتە خوارێ و جامە ئاوێک بکا بەدەم پیرەمێردێکەوە کە هەردوو دەستی لەرزۆکی لە قوڕ چەقیون، بەدەستەسرە پاکەکەی خۆی ئارەقەی گەرمی تەوێڵی هەریەکێکیان بسڕێتەوە، دەترسام ئەو هەموو پیاوە نیوە ڕووتە پەلامارم بدەن و جلەکانی بەرم دابکەنن، ئەو هەموو گەنجە پێ خواسە کە تا کونی چاوەکانیان لە قوڕ مەیی بوون وەک قوربانی هەر چوار پەلم ببەستنەوە و سەعات و ئەنگوستیلە و پێڵاوەکانم لەبەر دابکەنن، مێردمنداڵەکانیش گیرفانەکانم هەڵبتەکێنن، ژنە شەرواڵ لەبەرەکانیش وەک دەعەجانی سەیریان دەکردم، لە جوانی زۆر فەرامۆشکراو و کوژراوی ئەو کچانە ورد دەبوومەوە کە ڕەنگە لەدوای یەک حەمامی گەرم ببنەوە بەو کچە قەشەنگانەی لە سینەمادا منیان سەرسام دەکرد، بەڵام هەزار حەیف و مەخابن کە هەنووکە سەرتاپای بەرگیان هەمدیس قوڕولیتە بوو، کەسیانم نەدەناسی... نەشمدەوێرا پێیان بڵێم: *ئا خەڵکینە ماندوو نەبن... کوڕگەل... کچینە لەناو ئەو قوڕە وەرنە دەرێ و کەمەکێ پشوو بدەن... هۆ خاڵۆ... حەز دەکەم لەم پاکەتەی من جگەرەیەک بکێشی... دەمویست بیانکەم بەخاڵ و مام و چایەک بەیەکەوە بخۆینەوە... نەمدەوێرا بەکەسیان بڵێم دەست لە پاچ و پێمەڕە و خاکەناس هەڵبگرن و ئەو ئارەقەیە بسڕنەوە، ماڵنج و تەشووەکانی دەستتان فڕێ بدەن و گوێ لە حەکایەتی سەرگەردانی و وێڵبوونی من بگرن... گوێ لە چیرۆکی تاسە و تلانەوەم بۆ دیدەنی ئێرە و ئێوە...*





بەدرێژایی ئەو کۆڵانە هیچ دەرگایەک بەپێوە نەمابوو کە من بەهەردوو دەست، وەک لێقەوماوێک، بیکوتم تا لێمی بکەنەوە و داوای قومێک ئاو بکەم، نەدەکرا ئەو هەموو خەڵکە تووڕە و ماڵوێرانە لەکار بکەم و پێیان بڵێم:

**«من فەرهادم... شوانە چکۆڵەی ڕەنج بابردوو... عومر بەخەسار، قوتابییە تەمبەڵەکەی جاران کە هەمیشە لەسەر ئەزبەرنەکردنی خشتەی لێکدان و سرووددەکان هەموو ڕۆژ دارکاری دەکرا!»**

نا... نەدەکرا مام و خاڵ و پوورەکانم بناسمەوە، هاوسێ و هاوپۆلەکانی خۆم... ئاخۆ چەندیان ماون و چەندیان مردوون؟ دەت وت وام دەنێو خەونێکی ترسناک کە تیایدا کەوتوومەتە ناو تەلیسمێک و لێی دەرناچم، وام دەنێو پێچ و لوولی حەکایەتە سیحراوییەکانی نەنکم، توونی بابا، وێڵ دەنێو گۆبەندەکانی پێشهاتوو لە حەکایەتی (چل تووتی)دا، نەمدەزانی ئێستام خەون و خەیاڵ و درۆیە یان دوێنێ... نوقمی ئەو پرسیار و گومان و خەیالاتانە بووم کە خۆم بینی تا هەردوو ئەژنۆیان لە قوڕ چەقیوم و تا دێ هەنگاوم لە دوو نایە و گرانتر ڕێ دەکەم، بەهەردوو دەست لەنێو ئەو قوڕە زێلاقەیە سەولم لێ دەدا، تەکانم دەدا، هەروەک لە خەونەکان ڕوودەدا بەزەحمەتێکی زۆرەوە هەنگاوم دەنا، پرزەم لێ برا و دڵم خێراتر لێی دەدا و خوێنی دەنارد بۆ هەردوو بەلەکم تا بتوانم لەو قوڕە خەستە کە هەر دەت وت بۆ من گیراوەتەوە... بێمە دەرێ، تاکێک پێڵاوم لێ بەجێ ما، زەحمەت بوو بنووشتێمەوە و پێڵاوەکە بدۆزمەوە، هەر دەت وت لە قوڕچەقینی من بۆ ئەو مەردوومانەی خۆیان لە قوڕ چەقیبوون و بەهەردوو پێ دەیانشێلا دیمەنێکی زۆر ئاسایی بێ، کەسێکم نەدی خۆی سەغڵەت بکا و لەو قوڕە دەرم بێنێ، ناچار هەنگاوی گرانم دەنا و بێ باک و گێل لەو پەنجەرە دوورانەم دەڕوانی کە هەر دەت وت بەسیحری موعجیزەیەک، بەدوعای جادووگەرێک وان بەئاسمانەوە و ناکەون، ئەو دەرگایانەی کە هەمدیس سێ چوار خشت لە پاییندا ڕاگیری کردبوون، ئەو شەقڵە و

کاریتانەی بەحەواوە هەڵواسرابوون، سینەم پڕ بوو لە بۆنی قوڕ، خەونم بەوەوە دەدی کە ئەوەی دەیبینم جگە لە خەون هیچی دیکە نەبێ... مۆتەکەیەک کە کتوپڕ لێی وەئاگا بێم، خۆزگەم دەخواست لەناو قوڕەکە بێمە دەرێ و لە کۆتایی ئەو کۆڵانە تەنگەبەرەدا کە هەر هەمووی بەقوڕ گیرابوو پەنجەرەیەکی لێ بکرێتەوە، دەرگایەک بکرێتەوە و کۆڵان پڕ بێتەوە لە ژن و پیاوی ئاسوودە و ئارام، دراوسێی میهرەبان، چاک و چۆنی گەرم، هاوڕێیانی چەتوون کە هەمیشە بەدەم قریوە و خەنینەوە کلکی هێستر و کەرەکانیان ڕادەکێشا، پڕ بێتەوە لە هەراوهۆریا، قاووقیژ، هاواری دایک ئەو کاتەی دەیەوێ کوڕە بیژمۆتەکەی بێتەوە ژوورێ، دەنگەدەنگ و ئاوەدانی، هەیاهووی دەف ژەنان، هەر هەموو ئەو کەسانەی لێرە، بەمناڵی، بزرم کردن، زاق و زریقی زارۆڵەکان، ورشە ورشی گەڵاکانی شاتووەکەی بەرماڵی شیرین، قاقای لاو و تۆڵازەکان لەسەر ڕێگا و سەری کۆڵان، قریوەی شەرمن و خنکاوی کچە عازەبەکانی بەردەرگا، وەڕینی سەگێک، زەڕینی نێرەکەرێک و تریقانەوەی کۆڵانێک لە مناڵ، زریکەی کوڕێژگەیەک بەدەم گوێ ڕاکێشانەوە ئەو وەختەی باوکی لە هیچە کەللەیی دەبێ و بەشەپازللەیەک دەم و لووتی لە خوڵی سەر ڕێگاکە دەچەقێنێ، ڕەوتی خێرای ڕەوە ژنێک کە بەدەم دادوفیغانەوە رووەو گەرمکردنی پرسەیەک دەڕۆن، هاتنەوەی ژنە ڕەوەندەکان لە ماست فرۆشتنێ... دواجار لە قوڕ دەرچوونی من و کردنەوەی دەرگای ماڵی شیرین و... سەرسام بوونی دایکی و... وەیرۆ... وەیرۆ... بەڵام نا... تازە مەحاڵە لەناو ئەو وێرانەیەدا چکۆڵەترین خەونی من بێتە دی، باریکتر لە دەزوو ڕێگەیەک بۆ خەیاڵی من هەبێ، لەناو قوڕەکەوە دەرچووم کەوتمە سەر ڕێیەکی بەردەلان، بێ باکتر لە جاران ڕێم دەکرد و تۆز و خۆڵم لێ دەنیشت و ورتکە قوڕم لێ دەکەوتە خوارێ، کەچی نە پەنجەرەیەک بەحەواوە، نە دەرگایەک بەسەر خاکەوە: لە من نەکرایەوە، نە ژنێک... نە پیاوێک هەبوو میهر بنوێنێ و جامێک ئاوی ساردم بداتێ... چ خەونێکی ناخۆشە خودا...





ماندوو بووم... چی لەو ناخۆشترە بگەڕێیتەوە مەڵبەندی منداڵی و هەواری کۆنی خۆت... کەچی جگە لە بۆنی مەرگ و خاپووربوون هیچی دیکە بەدی نەکەیت... چ وەحشەتناکە بەدرێژایی کۆڵانێک درەختێک نەبێ لەژێر سێبەریدا خۆت لە قوڕ پاک بکەیتەوە و هەناسەیەکی حەوانەوە بدەیت، یان لەژێر سێبەری دیوارێکی بەرزدا سەرخەوێک بشکێنی، کانییەک نەمابێ شڵپێک ئاو بەدەم و چاوت دابکەیت و قاچ و قولت فێنک بکەیتەوە... چ ونبوونێکە کەسێک نەبێ پێت بڵێ:

«**ئا کابرا... فەرموو لادە... کۆتکە دۆیەک... جامە ماستاوێک**».

یەکێکی دیکە لێت بپرسێ:

«**ئەرێ ناکرێ گەورەمان کەی؟ خۆ جگە لە نان و پیاز و تەماتەش هیچی دیکەمان نییە...**»

یەکێکی دیکە هەڵیداتێ:

«**جا قوربان میوانی ناوەخت گلەیی لەسەر خۆیەتی!**»

ئاە... چەندە لە میوانێکی ناوەخت دەچم، چەندە بەد و ناشیرین و ئێسک گرانم، ئەوان چەندە چڵکن و قوڕاوی و من چەندە پۆشتە و پەرداخ و پاک دیارم، دەمویست لە شەرمانا هەتا زووە ئەو خەڵکە لە قوڕ چەقیوە جێ بهێڵم و بگەمە (ئەشکەوتی دیوان) کە ساڵ دوانزەی مانگ دڵۆپەی دەکرد، نسرم و تاریک خۆمی تیا ون بکەم، بەیادی جاران خۆم بەگیاوگۆڵە تەڕەکەی پاک بکەمەوە، ئەوساش کە دڵم لە باوکە و دایکە و مامۆستا و هاوپۆلەکانم و شوانەکانی هاوڕێم دەتۆرا خۆم لە ئەشکەوتەکە دەشاردەوە، نەنکم هەمیشە دەی وت کە گوایە پێغەمبەران لەناو ئەشکەوتەکان ژیاون و هەر لەوێشدا وەحیان بۆ هاتووە، بەدەم ڕێوە دەگریام و لەزەتم لەو فرمێسکانەی خۆم دەکرد کە کەس نەیدەبینی، وەک ئەوەی بەو فرمێسکانە گوناهێکی گەورە بشۆمەوە... گوناهێک کە زۆر دڵنیام نەمکردووە، بەخۆمم دەوت:

«**کابرا تۆ چیت داوە لە ئاوەدانی و ڕووناکی... تا زووە بگەڕێوە ناو**

**تاریکی ئەشکەوتەکان، چیت داوە لە ڕووناکی ڕۆژێک کە جگە لە کاولکاری و دڵڕەقی هیچی دیکەی تیا نابینی!»**

دەڕۆیشتم و جگە لە تەقەی پاچ و پێمەڕە کە بەر بەردەکان دەکەوت گوێم لە هیچی دیکە نەبوو، لە خرچە خرچی خاکەناس کە لە قوڕ دەچەقی... هەناسەبڕکێ و هانکە هانکی بێ بڕانەوە، بەدەم ڕێوە ساتمەم لە بەردی نەقارکراو و تۆپەڵە گڵ و خشت و تلیسی ڕژاوی کا و کاریتە و شەقڵە و قیسپ و تانۆک و حەسیر و تەنەکە و چروو دەکرد، بەترسەوە ئاوڕم دەدایەوە، هەر دەت وت ساڵ و مانگ و ڕۆژەکان ئەو لەتکە قوڕانەن وشک بوونەتەوە و بەدەم ڕێوە لێم دەکەون، شکابوومەوە بەسەر سۆزێکی ساوا و سادە و دێرین کە هەنووکە لە دڵما زۆر پیر بووە و نایناسمەوە، دیسانەوە ناتوانم بپرسم ماڵی شیرین وا لە کوێ، لە سەعاتەکەی مەچەکم دەڕوانم و دەمەوێ بزانم ڕۆژ چ وەختە... سەیرە... تۆپەڵێک قوڕ گرتوویەتی و کە پاکی دەکەمەوە دەبینم چرکە ژمێرەکەی لەسەر دوانزە وەستاوە، لە دوورترین دورگە، لەسەر بڵندترین ترۆپکی چیاکان، دەنێو فڕۆکە و پاپۆڕ و شەمەندەفەری پڕ لە خەڵکی بیانیی و نەناس، دەنێو ئەو شارە جەنجاڵانەی کە کەس ئاوڕت لێ ناداتەوە... ئاواهی و وەک هەنووکە تەنیایی نەیکرۆشتووم، بێکەسی غەمگینی نەکردووم، ئاواتەخواز بووم لەو سەری کۆڵان کەسێک دەربکەوێ و باوەشم بۆ بکاتەوە و لەشی ماندووم بەپێوە ڕابگرێ و فەرمووی بن هەیوانێک، ژێر سێبەری درەختێک، بن دیوارێکی ڕماوم لێ بکا...

نەبوو... نەبوو... نەبوو چەندە ئەم شارۆچکەیە لە شارۆچکە خاپوورەکانی ناو حەکایەتەکانی نەنکم دەچێ، ئەو ڕێگایەش کە وێڵی کردووم، هەر دەڵێی ئەو ڕێگایەیە پاڵەوانە چکۆڵە دەباتەوە سەر ڕێی کوشتنی ئەو دێوەی بەری ڕووباری لە ئاوایی گرتووە و خەریکە مەڕ و ماسی و مەل و مرۆڤ بەیەکەوە بخنکێن... چ درۆیەکی گەورەبوو کە لە حەکایەتەکەدا پاڵەوانە چکۆڵە دێوەکەی دەکوشت و بەری ڕووباری دەکردەوە و ئاوایی تێر





ئاو دەکرد و... بەرد و داریش تینوێتی دەشکا، ڕێی پاڵەوانی دێوکوژ گوڵڕێژ دەکرا... کەچی ڕێی من جگە لە دڕک و داڵ و لە قوڕ چەقین هیچی دیکە نەبوو، چ درۆیەکی گەورە بوو کە یەکەمێن کەس خانمە چکۆڵەی دولبەری بەشکۆ و شانازییەوە ماچی دەکا، تۆ بڵێی ئەو ڕابردووە هەر هەمووی بووبێ بەو تۆز و بایەی لێرە و لەوێ، لەناو ئەو شارۆچکە کاولەدا، دەبێ بەگەردەلوول و خەڵکی لە یەکدی بزر دەکا، تۆزوبایەک ڕووەو ئاسمان هەڵبکشێ و چڵ و چێو و گەڵا و هەناسەی هەر هەموان تا نێوان ئەستێرەکان ببا و پاشان پەرتوبڵاو و بزریان بکا، چ تۆزوبایەک... چ گەردەلوولێک... لە خۆم دەپرسی ئەم ڕێگا قوڕاوییانە دەمبەنەوە کوێ؟ ئەمەیان چ کات و شوێنێکە کە نایەمەوە سەریان و وێڵبوونم مسۆگەرە، چ وەختێکە و چ وەرزێکە کە کەوتۆتە دەرەوەی زەمەن و وەستانی سەعاتەکەی دەستم و... چۆن چۆنی ڕێز لە خولانەوەی زەوی ناگرێ بەدەوری خۆردا؟ درێژبوونەوەی مەوداکان و یادگارەکان... چ خەیاڵێکە کە وەک بەردێک لەناو کەللەمدا جێگیرە و بۆم لەق ناکرێ و... نامگوێزێتەوە سەردەمێک کە من تیایدا منداڵێکی دەم پڕ لە گرین و خەنین بووم... بۆچی هەموو شتەکان بەوێڵبوونی من تا ئەبەد وێڵ بوون؟ ئەوەندە وڕوکاس و سەرلێشێواو بووم نەدەچوومەوە سەر ئەو ڕێگایەی دەمباتەوە ناو ئەشکەوتەکە، دەمزانی گەر مەزاری (چاکی پەڕۆ) بدۆزمەوە، لەوێوە بەهەورازێکی پڕ لە کەند و کۆسپ سەردەکەوم تا دەگەمە ڕەوەزە شاخێک کە دەیان وت دێوێک بەفووی خۆی کوناودەری کردووە، ئیدی لەوێوە بەشەست قالدرمەی بەردیندا غل دەبوومەوە و دەگەیشتمە ئەشکەوتەکە، کتوپڕ و بۆ یەکەم جار خودا خەیاڵی منی خوێندەوە، وەک ئەوەی هەموو جار لە حەکایەتەکانی نەنکم ڕووی دەدا، هەمیشە کە من و پاڵەوانەکەی ون دەکرد، دەیزانی وەڕس و بێزارم و خەریکە لە قەهری وێڵبوونی پاڵەوانە چکۆڵە چاوانم پڕ دەبن لە فرمێسک، خەریکە هەناسەم سوار دەبێ، دەیزانی کە سەری لووتم ئارەقەی کرد و لێوم کەوتە تەتەڵە و کە هەردوو پەڕەی گوێیەکانم سوور هەڵدەگەڕان... دەیزانی

گەر فریای من و پاڵەوانەکە نەکەوێ بەخەمەوە دەخەوین و لە شوێنێکدا حەکایەتەکە دەمرێ... دەی وت ڕۆڵە ئەها خودا چەند بەبەزەییە و چۆن خەیاڵی پاڵەوانەکەی دەبینێ... ئەوسا نەمدەزانی... بەڵام کە لێرە وێڵ بووم... هەنووکە تێ دەگەم ئەوە نەنکم بوو خەیاڵی منی دەخوێندەوە و وەک داشی دامە پاڵەوانەکەی دەجووڵاند، هەستم کرد ئەوە نەنکم بوو لە قوڕەکە دەری هێنام و لە ناکاو لە پێچێکی ڕکدا ڕووەو دەستە ڕاست کۆڵانێکی تەنگەبەر منی گەیاندە سەر مەزارەکەی «چاکی پەڕۆ»... سەیرە... لە دوای ئەو هەموو خەراباتە دواجار گەیشتمە شوێنێک وەکو خۆی مابۆوە، ئەو مردووەی ناو گۆڕەکە هەر کەسێک بێ: چ دز و چەتە، پیر و پیاوچاک... بەچرپەوە پێی دەوتم کە لە هەموو ئەو پیاوانە زیندووترە کە پاچ و پێمەڕە دەوەشێنن، بەڵگەش نەڕمانی ئەو گومەزەیە وا بەسەر سەرییەوە... بۆنی بخورد و گوڵاو هەمان ئەو ترس و سامەی پێ نەبەخشیم کە بەمنداڵی هەستم پێ کرد... تەنها ئەوەبوو لە بۆنی قوڕەکەی کەم کردەوە، بەدەم باوە پەڕۆ سپی و سەوزەکان دەشنانەوە و گوێم لە وژەوژێکی غەمگین بوو، وەها غەمگین کە خامۆشم بکا، لەناو چێورمەکەدا توانیم کەمێک لەو قوڕە لە خۆم داتەکێنم کە بەپانتۆڵ و چاکەتەکەوە وشک ببۆوە، بەتاکێک پێڵاو لە شێتێکی بەلەسە و هار و هەڵەتە دەچووم کە لە ترسی منداڵانی چەتوون ئەو مەزارەی کردبێ بەپەناگە، سێ مۆم کز دەسووتان و تەنها بنکیان مابوون، بەڵام هیلاکی ئەوەبوون بەدەم باوە نەکوژێنەوە، لە هەوای ناو مەزارەکە و سووتانی سێ مۆم بۆنی جێماوی چەند ئادەمییەکەم دەکرد کە لەوە دەچوو، یان خەیاڵی خۆم بێ، چەند ژنێکی دەم پڕ لە هاوار و ناڵە و نزا بووبن، جگە لە من و ڕۆحی (چاکی پەڕۆ) کەسێکی دیکەی لێ نەبوو، شوورەکەی بەدیوی ڕۆژهەڵاتدا ڕمابوو، کەسێک لە ترسی خودا بەرد و خشتێکی زۆری بەسەریەکدیدا کەڵەکە کردبوو، دەمویست پانتۆڵەکە دابکەنم و بەئاوی کووپەکە قاچ و قولم بشۆم... نەمویرا... ترسام لەوەی چەند ژن و کچێک بۆ نزا و پاڕانەوە و پەڕۆهەڵواسین بێن و منی نیوە





ڕووت ببینن و سڵ بکەنەوە، خشەخشی سۆلێک لەودیو شوورەکەوە دەهاتە بەرگوێم، دڵم داخورپا و خۆم نەوی کرد، چرپەچرپێکی خنکاو و بەدواییدا خامۆشی، چەندەها جار کە دڵم لە باوکە دەتۆرا ئەو کاتەی فەلاقەی دەکردم، یان لە مامۆستای ماتماتیک کە لەسەر خشتەی لێکدان هەردوو ناولەپمی سوور دەکردەوە... دەهاتمە ئێرە یان ئەشکەوتەکەی دێوان، لەژێر سێبەری پڕ لە سام و سەنگینی شوورەی ئەم مەزارە دەگریام و دوعام دەکرد کە خودا یا من یان ئەوان بکوژێ، لە عەبا و تەشک و تیرێژی کراس و کەوای ئەو کچ و ژنانە ورد دەبوومەوە کە خۆیان لە کێلەکان هەڵدەسوو، باسکیان تێ وەردێنان... بەیەکەوە و بەقەهرەوە وەک گورگی بریندار دەیانلووراند:

**«خودایە... ئاهونزولەم بگاتە بەر قاپی توو... خودایە... مرازم حاسڵ کەی... سەگی بەر قاپی چاک و پیرەکانی تۆم و نائومێدم مەکە»** .

هەمان درەختەکەی جارانە، پتر باڵای کردووە، ئەو درەختەی پیاوە پیرەکانیش نەیاندەزانی ناوی چییە، خۆزگەم دەخواست شاتووەکەی بەردەمی ماڵی شیرین، دار هەنجیرەکەی ئێمەش ئاواهی شنەشن بەڕووی ئاسماندا وەستابان، وەک زەمانی زوو بەقەد گەڵاکانی پەڕۆی سپی و کەسکی تێ ئاڵاوە، تیلمە و پارچەی زراو و باریکی جۆرەها پەڕۆی کۆن و نوێ: قەدیفە، قەستۆر، کودەری، مادەم، حەوت ڕەنگ، جەرسە، مارۆکە، لینۆ، کەتان، خەزنە، ئەتڵەس، چیت، کەڕنەک، تافتە، ئاگرباران، جورجێت... هەر هەمووشی بێ جیاوازی لەگەڵ گەڵاکان کەوتبوونە ژێر بارانی ڕیقنە چۆلەکە... ئەو پارچە قوماشە زراو و باریکانە دەیەها ژنی خانومانی بیر دەهێنامەوە: (لەعلی خان): چ ژنێکی مەند و لەسەرخۆ، شاعیر و بەیتبێژ، لاوانەوەی لەسەر مردووەکان بەردی دەتواندەوە، (خاپیرۆز) کە وەک پیاوان تەزبێحی بادەدا، (خانا شێخە بەگی) کە هەرگیز نەیدەزانی عەبای ڕەش چییە و هەمیشەش عەبای ژنەکانی دیکەی لە پرسەکان دەدزی و دەیدڕاندن، ژنێکی زۆر بڵند و چوارشانە و سوور و

سپی، (پلکە هەیاس) کە هەمیشە پێڵاوی پیاوانەی لە پێ دەکرد، ژنێکی بەسام و هەیبەت و نوورونەزەر، هەر ئەوبوو نەیهێشت چیدیکە (پلکە کامیلا) کچانی گەڕەک خەتەنە بکا، (عەیشێ خان) کە لەبەر چاوی پیاوان خۆی داوێشتە کانی فەقێیان و غوسڵی لەخۆ دەردەکرد. (دورێ): خانمە چکۆڵە کە هەرگیز لە بنێشت جوین نەدەکەوت، (حەلیمە) خانی دەف ژەن... بەڵام ئەو پارچە قوماشانە دەیەها ژنی دەم پڕ لە هاوار و ناڵەی بیر دەهێنامەوە کە بەردەوام دەهاتنە ئێرە و تەقەللایان بوو وردە بەردی خڕ و پان بەهەردوو کێلە چەورەکەوە بنووسێنن، بەدەم نزا و پاڕانەوە... بەدەم گریانەوە داوای مێردی خاس و منداڵی سەر بەرزقیان دەکرد، گەڕانەوەی کوڕ و برا لە سەفەر و جەنگ، گەر وردە بەردەکان بەکێلەکانەوە نەنووسابان دەبوو بەشین و شەپۆڕ و گریە و زاری، کە ڕاگیر دەبوون خەنینی خنکاو و ئۆخژن بەدڵیاندا دەهات و بەبریسکە بریسکی چاوان لێکدی ڕادەمان، هەمان جۆلانە کە بەدرەختەکەوە هەڵبەسترابوو، هەر ژنێک منداڵێکی لە خودا بویستایە بەردێکی تێ دەهاوێشت، لەگەڵ هەژانی جۆلانەکە کسپەیەک لە دڵی ژنەوە برووسکەی دەکرد و تا ناو ڕەحمی نەدەوەستا... ژنانی دیکە پێیان دەوت:

**«مزگێنی بێ... بەداک و باب گەورەبێ!»**.

هەر لێرەبوو وەک منداڵێکی چڵمن و چکۆڵە و جیقن دەکەوتمە ژێر دەست و پێی ئەو ژنانەی تێک دەقژقژان، بەدەوری مەزارەکەدا دەیەها جار خولیان دەخواردەوە، گوێم لە دوعا و ورتەورتیان دەگرت کە بەسەر سەری مندا دەڕژان، بەدەم لێوە لەرزەوە حاڵیان لێ دەهات، قژ بژ و چاو لە مۆڵەق، نیگای پڕ لە ترس و شەرم و نزای ئەو ڕوخسارانەی تاوێک گرژ و تاوێک دەکشان، قوڵپی گریان لە ترسی گوناهێک کە نەیانکردووە، ئاهوحەسرەت، درکاندنی ڕستەیەک کە بۆنی شەهوەتی تۆڵەی لێ بێ، دوعای مەرگ خواستن و ژیان خواستن، کوشتنی دوعایەکی پەنهان لە دڵدا کە دەبوو هەر بەتەنها خودا و چاکی پەڕۆ بیزانن، لەگەڵ خولانەوەیان بەدەوری مەزاردا





من بەبۆنی ژنەکان گێژ دەبووم کە لە هەوادا جێ دەما و تێکەڵ بەبۆنی بخورد و گوڵاو و مێخەک و قەرەنفول دەبوو، دەمدی کچەکان سینە و بەرۆک لەو کێلە ڕەقە هەڵدەسوون و بەناڵەیەکەوە دوعایان دەکرد کە من تا ماوم لە یادم ناچێ، من ئەو ناڵەیەم تەنها لەو کچانە بیست کە ئێستا تێ دەگەم شەرم و حەیا کوشتبوونی، هەناسەبڕکێ و ڕەنگ هەڵبزڕکان و ئاخ و ناڵینی ئەوان، بوورانەوەی کتوپڕ و پەل کوتانیان منی سەرسام دەکرد، هەندێک لەو کچ و ژنانە بەر لەوەی لە دەرگای کراوەی مەزارەکە بێنە ژوورێ یەک تەختە دەکەوتن و لە هۆش خۆیان دەچوون، هەر چوار پەلیان وەک تەختەدار نەدەجووڵان، ڕەنگ زەرد و نیوە مردوو کەفێکی سپی لە هەردوو گۆشەی بەسەر یەکدی قرساوی دەم و لێویاندا بلقی دەکرد، چاویان وەردەگەڕا و سپێنەیان وەدەر دەکەوت، ژنانی دیکە بەپەلە جامیان لە کووپەکە هەڵدێنا و وەک ئەوەی نانی تیری برشێنن دەموچاوی ئەو کچ و ژنە نیوە مردووانەیان تەڕ دەکرد... تاکە کەسێک نەنکم بوو کە زۆر دلێرانە دەچووە سەر مەزارەکە، هیچ پارچە پەڕۆیەکی بەدرەختەکەوە هەڵنەدەواسی، هیچ بەردێکی بەکێلەکەوە نەدەنووساند، نێرانە و بەدەنگێکی گڕ و پیر سڵاوی لە (چاکی پەڕۆ) دەکرد، هەر بەپێوە فاتیحەیەکی دەخوێند و ورتەورتێک لە دەمی بێ ددانییەوە دەکەوتە بەرپێیان، من لەگەڵی دەهاتم تا بەیەکەوە دوعا بکەین هەتا زووە خوا گەورەم بکا، هەتا زووە باڵا بکەم و بازووم ئەستوورتر بێ، تا ڕۆژ و مانگ و ساڵەکانم بۆ کورت ببنەوە، ببمە ئەو شوانەی کە دواجار یان دەبێ بەشاعیر یاخود بەعاشق، وەک لە حەکایەتەکانی نەنکم ڕوودەدا، ببمە ئەو فەرهاد-ەی کێوی بێستوون کون دەکا و ڕووبارێک بەدیاری بۆ ئاوایی خنکاو دێنێ و... دواجار بەدیداری شیرین شاد دەبێ، هەموو جار کە دەیویست مەزارەکە جێ بێڵێن چمکی فەقیانەکەیم دەگرت و لێی دەپاڕامەوە کە سێ چوار دوعای بەپەلەی دیکەم بۆ بکا، چونکە دایکم دەی وت:

**«جیقن ساڵ بەساڵ لەبری ئەوەی گەورەتر بێت... دەچی بەناخی ئەرزدا...**

**هەر دەڵێی لێت دەگرنەوە!»**

وەلێ لەو دەیەها خەونە خۆشەی نەنکم لە ڕۆحما دەیچاند، یەکێکیان نەهاتەدی... هەنووکە تێ دەگەم چ درۆیەکی گەورەیە... چ ئەفسانەیەکی هیچە گەورەبوون... ڕۆژانی تەمەن گوزەشتن و من جگە لە شوانێکی دۆڕاو، شاعیرێکی بێ بەهرە، هیچم لێ دەرنەچوو، چ ڕێبوارێکی دەستخەڕۆ بووم، چ گەڕیدەیەکی مایەپووچ، چ فەرهادێکی دۆڕاو کە نە شیرین بوو بەدڵخوازی، نە ئاوی بۆ ئاوایی هانی، دواجار لەم سەفەرە درێژەدا هاتوومەتەوە سەر کەلاوەیەکی ڕووخاو... شارۆچکەیەکی داڕماو، چەند لەو ئەسپە دەچم کە لە تاوی غاردا سەرسم بدا و هەر چوار پەلی بشکێن... دەگریام و... حەزم دەکرد زوو گەورەبم، دەمخواست لە چیا و ڕووبارەکان بپەڕمەوە، کە باڵق بووم هەموو خەونم ئەوەبوو لە خێڵ تەوەللابم، ئەو وەختە... سەردەمی شەرم کردنم بوو لە گەورە نەبوون، بەغیلیم بەگوڵەگەنم دەبرد کە چۆن بەتاوە بارانێک باڵا دەگرێ، بەکارژۆڵە کە چۆن لە دامێنی دایکی دەکەوێتە خوارێ و یەکڕاست هەڵدەستێتەوە سەر پاشووان، حەزم دەکرد گەورە ببم و تا زووە پێم بگاتە ئاوزەنگی و سواری یەکێک لە ئەسپەکانی باوک ببم و بفڕم بۆ ناو حەکایەتەکانی نەنکم، بۆ ئەو ئاسمان و شارانەی ئەم بۆمی وەسف دەکردن، بەدزی نەنکمەوە دەهاتمەوە سەر ئەم مەزارە و هۆن هۆن دەگریام... خودایە تۆ بۆ ڕقت لە منە و ناهێڵی گەورەتر بم؟ بۆ دەبێ تا ماوم چکۆڵە و جیقن بم؟ دەمویست خۆم پێشەنگ و سەرقافڵەچی کاروان بم، بەدزی باوکمەوە جگەرەم دەکێشا و تەزبیحم هەڵدەگلۆفی... گەندە مووەکانی سەر لچم دەتاشی تا چی زووە تووکن بم... وام مەزەندە دەکرد جگەرە و تەزبیح و دەست بردن بۆ مووس گەورەترم دەکا، ئاخ چ درۆیەکی شاخدارە گەورە بوون... ڕۆژ و مانگ و سالانی هەپروون بەهەپروون، لەسەر ئەم مەزارە بەرهەنسکم هەڵدەدا و دەپاڕامەوە: خودا کەی بێ و زوو گەورەبم... ڕووەو شارە زۆر دوورەکانی ناو حەکایەتەکانی نەنکم سەفەر بکەم، ئەو شارانەی پڕن لە باخ و بێستان و





ڕووبار و ژنی میهرەبان و باوکی مێرخاس و دایک و خوشکی جگەرسۆز، هاوڕێی بەوەفا... لە باخان میوە بخۆم و لە ڕووبارەکان مەلە بکەم و هەر شەوە و لەسەر ڕانی خوشکێکی دڵنەرم بخەوم، گەورە ببم و حەزم لێ بکەن کچە نەباڵق و ساویلکەکان... نەنکم دەی وت پەلەی چیتە ڕۆڵە هەر گەورە دەبیت... کەڵەگەت بەقەد ئەسپینداریک، سمێڵت گووگرە دەبێ و شارەوشار وڵاتان دەگەڕێی... هەزاران دڵ و دەرگا و پەنجەرەت بەڕوودا دەکرێنەوە... ڕۆڵەی شیرینم مەگری بۆ گەورەبوون... ڕۆژێک دێ پەشیمان بیتەوە لەو خۆزگەیەت... چ مەرگەساتە چ عومرێکی بەهەدەر چوو بوو من ژیام... خودا بتگرێ نەنێ... کوا ئەو دەرگا و دڵ و پەنجەرانەی دەبووایە بەڕووی مندا بکرێنەوە... کوانێ؟ کەسێک دەست هەڵنابڕێ سلاوێک لە منی ماڵ بەکۆڵ بکا... خێرهاتن یان ماڵئاواییم لێ بکا... «نە کەس دێ و... نە کەس دەڕوا... هیچ شتێک لەم ناوە ڕوو نادا»... چ بێزاری و مردەنییە گەورەبوون ئەو کاتەی ڕۆحت بەر لە خۆت دەفڕێ و دەگاتەوە کۆنە هەواری خاڵی و... ماڵی چۆڵ و... شاری خەرابات... خودا بتگرێ نەنێ... کوا ڕوخساری شیرین-ی ئەرمەن؟ من لەبری ئاو بۆ ئاوایی... هەر دەڵێی مەملەکەتێکی کاول و مەرگم لەگەڵ خۆم هێنا، هەر دەڵێی منم ئێرەم خاپوور کردووە و... ئامادە نیم بەردێک بخەمەوە سەر بەردێک، چەندە ترسنۆکم... هەر دەڵێی منداڵە بەزیو و شەرمنەکەی جارانم و ئەو مەزارەم کردووە بەپەناگە... چ شەرمە بەدوای تاریکی ئەشکەوتێکدا دەگەڕێم تا خۆمی تیا حەشار بدەم... چ تراویلکەیەک بوو ژینی من... سەفەری من... عیشقی من... چ گریان و دۆڕان و دەردەسەرییەک... چەندە ڕاستە... چەندە ڕاست بوو کە دەت وت:

**«ڕۆژێک دێ پەشیمان بیتەوە لە گەورەبوون!»**

خودا بتگرێ نەنێ گیان... حەکایەتەکانی تۆ بوون کە ملی منیان شکاند، تا ئەمڕۆکە و تا ئەبەد منیان فریو دا، یەکەمین حەکایەتی عیشق و سەفەری تۆ کەللەی منی پڕ لە خەیاڵ کرد و... هەتا هەتایە دەستخەڕۆی

کردم، چیرۆکی پڕ لە هیوا و نائومێدی و خۆشی و حەسرەتەکانی عیشق و ئەڤین... بەو تەمەنە ساوایەوە دووچاری شتێکت کردم کە خۆیشم نەمدەزانی ناوی چی لێ بنێم... گوناهی تۆ بوو مێشکە چکۆڵەکەی منت پڕ کرد لە حەکایەت و ئەفسانە و داستانەکان، شەوانیش هەر بەخەون دەچوومەوە ناو ئەو مەملەکەتانەی تۆ دروستت دەکردن... چەندە منت ژیاند لەگەڵ چیرۆکی شیرین و فەرهاد، لاس و خەزاڵ، خەج و سیامەند، خورشید و خاوەر، لەیلا و مەجنوون، مەم و زین، کوڕە کەچەڵ و کچی پادشا، وەها حەکایەتەکانت دەگێڕایەوە خۆم لێ دەبوو بەفەرهاد، لاس، سیامەند، مەجنوون، مەم... دەبووم بەپاڵەوانی نەبەزیوی هەر هەموو داستانەکانت... ئیدی خەونم دەدی زوو گەورەبم و بالاّ بکەم... هەر تۆش بووی نەنێ فێرت کردم گەر بمەوێ هەر مانگە و قولانجێک درێژتربم وا چاکە ڕۆژانە خۆم بەلقێکی ئەستووری دار هەنجیرەکە شۆڕ بکەمەوە... کەچی هەر خۆت دەت وت:

**«واز لەم خەیاڵە خەراپانە بێنە ڕۆڵەگیان!»**

دەتترساندم لە عیشق و سەفەر و گەورەبوون و گیرۆدەبوون...!

هەموو جارێک کە چیرۆکەکانی دەگێڕایەوە هۆن هۆن دەگریا.

من دەمپرسی:

**«نەنێ بۆچ لە کۆتایی هەر حەکایەتێک ئەوەندە دەگریت...!»**

هەر ئەوەندەی دەوت کە عیشق جگە لە گیرۆدەبوون و دەردەدڵ هیچی دیکە نییە... دەمپرسی:

**«نەنێ گیرۆدەبوون چییە!»**

نەیدەزانی چۆن کەللەپووتێکی وەک من حاڵی بکا... دوای دەیەها جار لە پرسیارکردن وتی:

**«وەکو ئەوە وایە بزنە شێتەکەی تۆ لە ڕاستەڕێ لابدا و بگاتە سەر هەڵەمووتێک، شوێنێکی زۆر عاسێ، وەها گیرۆدەبێ کە نەتوانێ بگەڕێتەوە ناو مێگەلەکەت، خۆ ئەگەر بشیەوێ بجوولێ و بڕواتە پێشێی**





**بکەوێتە ناو خەرەندەکە و هەڵدێرێ»**.

من بیرمە جارێکیان بزنێکمان کەوتە شوێنێکی وا عاسێ کە بەهەر هەموو ئاوایی پێمان قورتار نەکرا... ئیدی بەنێو داروبەردی ئەو خەرەندەدا هەڵدێرا و لاشەکەیمان نەدۆزییەوە.

دیسانە دەمپرسی:

**«نەنێ گیان... عیشق و گیرۆدەبوون و عاسێ بوونی بزنە شێت کەی وەکو یەکن؟»**.

دەی وت:

**«با... کەسی عاشق، چ پیاوبێ و چ ژن، وەک بزنە شێتەکەی تۆ وایە... جاری وا هەیە چڵەگیایەک لەسەر دوندێک، کۆتایی کوێرەڕێیەک فریوی دەدا، دەکرێ تۆ بزنەکە بیت و هەموو دەوروبەرت سەوزەگیابێ، مێرگی تەڕوبڕ، کەچی تەماعی چڵە گیایەکی لەعنەتی لە جێگەیەکی زۆر عاسێ بتبات، تۆ ڕەنگە بزانیت ئەو ڕێگایەی دەتباتە سەر ئەو دوند و هەڵەمووتە کوێرەڕێ بێ، لەو سەرەوە ڕێی هاتنەوەت نەبێ، دەگەیتە چڵە گیایەکە و دەمی بۆ دەبەیت، لە خوارتەوە خەرەند و هەڵدێرێکی هەزار بەهەزارە و چاوەڕێت دەکات... بەڵام تۆ تا دەگەیت بەمەرامی خۆت چاوت هیچ نابینێ... چونکە حەز و تەماعەکە کوێرت دەکەن... ئیدی خۆ لەوانەیە هەڵدێرێی...!»**

بەفیزی منالێکەوە کە بزن نییە و شوانی مێگەلێکە دەموت:

**«بەڵام نەنێ... من دەزانم ئەوە هەڵدێر و هەڵەمووتە... بەس بزنەکە نازانێ»**.

سەرمی دەخستە کۆشی و دوو چەپۆکی دایکانەی پێدا دەکێشام و دەی وت:

**«ئێ... خۆ دەزانم تۆ لە بزنەکەت عاقڵتری... بەڵام ئەی لە خۆت ناپرسی ئەو بزنە هارەی تۆ بۆچی لە ڕاستەڕێ لادەدا و ئەو هەموو سەوزەگیایە بەجێ دێڵێ و ملی خۆی بۆ چڵە گیایەک دەشکێنێ کە لەسەر بەردێک**

**ڕواوە؟!»**

کە من دەموت:

«**نەء... نایزانم!**».

نەنکم بەلاقرتێوە دەی وت:

«**چونکە کوێرایی داهاتووە!**».

خـامـۆش دەبووم و بیـرم لەوە دەکـردەوە ئاخـۆ چیم لێ دێ گـەر بزنە شێتەکەی من بۆ چڵە گیایەک خۆی بکوژێ، بێ ئۆقرە کە بزن و مەڕەکانم ڕادەدا هەمیـشـە لەوە دەترسام لەسـەر هەڵەمـووتێک خـۆی عـاسێ بکا و هەڵدێرێ، ئاخر لە هەموو مـەڕ و بزنەکـانی دیکە پتـر من ئەو بزنەم خـۆش دەویست، ئەو بزنەی زۆر جـاران دەکـەوتمە دوای... لەگـەڵ خـۆی دەیبـردم، فێری دەکردم چۆن لە ڕاستەڕێ لابدەم و خۆم بدەمە دەست کوێرە ڕێگاکان، باوکم و دایکم و نەنکم، خوشک و برا و پوورەکـانم، شـوانەکـانی دیکە، هاوپۆلەکانم دەیان وت:

«**ئەو حـەیوانە لە بزن ناچێ... هەبێ و نەبێ ڕۆحی شـەیتـانێکی وا تێدا!**».

چەندین جار ویستیان بیکەن بەقوربانی و قورتاریان بێ، باوکە دڵڕەقانە لەبەر چاوی من هەردوو پێی گـەورۆنەی لەسـەر پاشـووەکـانی دادەنا و چەقۆکەی لە گەردنی هەڵدەسوو، من وەها بەدڵ و کوڵ دەگریام کە نەنکم سکی پێم بسـووتێ... ئیـدی هەر جـارە و بەبیـانوویەک چەقـۆکەی بەباوکم فرێ دەدا... ئاخر هەر کە لەدایک بوو خۆم لە خوێناو پاکم کردەوە، هەر کە بوو هەستـایەوە سـەر چوارپەلان، دوو سێ جاران ڕەتی برد، گێـژ و چکۆڵە بەلادا دەکـەوت، دەسـتم دەدایە بەرسکی و ڕاست دەبۆوە، بەسێ چوار خـۆ ڕاوەشـاندن خـۆی لە خـوێناوی سکی دایک پاک کـردەوە و تێی تەقـاند، بەدەم بای غـارەوە سێ چوار جـار کـەوت و لە خـۆڵ و تۆز گـەوزی و هەستـایەوە، من ڕۆژ بەڕۆژ دەسـتم لە تیسـکەکـانی دەدا و دەمـدی چۆن لە مـوویەکی زۆر نەرمـەوە زبر و لـوول دەبوو، چۆن چاوەکـانی ڕەنـگ و





ڕووناکیان تێ دەڕژا، سمەکانی ڕەق دەبوون، مانگ بەمانگ قاڕینەکەی لە گوێمدا دەگۆڕا. چۆن لە کاریلەیەکەوە بوو بەجوشتیر من بیرم نایە لە کەیەوە باوکم منی خستە دوای مەڕ و بزنەکانی، لەوە دەچێ هەر کە پێم گرتووە و کەمەکێ فەراقە بووبم منیان کردووە بەشوانە بچکۆڵەی ئەو خێڵەی خۆمان، زوو زوو نەنکم دڵی خۆش دەکردم... هەمیشە لەوم دەبیست کە شوانەکان یان عاشقی گەورەیان لێ دەردەچێ یاخود دەبنە شاعیر... دەمپرسی:

«**بۆچی وایە نەنێ؟**»

دەی وت: «**شوانەکان هەمیشە بەتەنیان، چ لە بیابان بن و چ لەناو شاخ و داخان، ئەوان وەکو مە پیس نابن، دوورن لە درۆ و دەلەسە و فڕوفێڵ، شوان کوڕی ئاو و گڵە... یەکەم کەسە خۆری لێ هەڵدێ و... لێی ئاوا دەبێ، لە زمانی حەیوانەکانی خۆی حاڵی دەبێ...**».

هەموو جاران، شەوانە دوای گێڕانەوەی حەکایەتەکانی عیشق و گیرۆدە بوون بەقەهرێکەوە دەی وت:

«**... کە حەجـێڵ بووم چەندە حەزم دەکرد شوو بەشوانێک بکەم... خوا نەیکرد**».

پاشان دۆش دادەما و تاس دەیبردەوە، چاوانی پڕ دەبوون لە تەمی خەم و گریان و دوو تنۆک فرمێسک دەڕژانە سەر کوڵمە چاڵەکانی... هیچی دیکەی نەدەوت... دەمویست بزانم ئەو کە باشترین حەکایەتخوانی چیرۆکەکانی عیشقە بەحەزلێکردن شووی بەباپیرەم کردووە... دەی وت:

«**بیرێتەوە ڕۆڵە... لە دوای مردووان قسەی خێر باشترە... باپیرت پیاوێکی خەراپ نەبوو.**»

کەللەی چکۆڵە و پووتی من بەو وەڵامە نابەدڵە بەحاڵ جێگەی گومانێکی منداڵانەی لێ دەبۆوە، گومان لە نەنکم کە عیشقێکی دۆڕاو وای لێ کردبێ وەها بەچێژ و تاسووقەوە ئەو هەموو حەکایەتانەی عیشق و ئەوینی ڕەوان بێ و وەک دەفتەر لە دڵیا هەڵیانیگرتبێ، هەر شەوێکیش بەجۆرێک بیگێڕێتەوە کە من سەرسام و کەمەندکێشی ناو تانوپۆی

چیرۆکەکانی بکا... لەو تەون و تەپانە بئالێم و دەرچوونم لێی مەحاڵ بێ، بمبا بەناو توونی بابا و وێڵم بکا، هەناسە سوار و پڕ مەراق بکەومە دوای پاڵەوانەکانی کە لەو سەفەر و عیشقانەدا یان دەمرن یان دەگەن بەمەرام. نەنکم بوو بەدبەختی کردم... خەیاڵی خۆش دەکردم بەوەی کە ڕۆژێک دێ من وەک (فەرهاد)ی سەنگتاش بەهێز و عاشق بم، شیرین-ێک دێ و دڵم دەبا و ئیدی گیرۆدەی دەبم... دەی وت:

**«... وەک بزنە شێتەکەی خۆت بۆ چڵە گیایەک لەسەر هەڵەمووتێک عاسێ دەبیت...!»**

هەر زوو پەشیمان دەبۆوە و دەترسا و توند باوەشی پیا دەکردم، دەیدایە پرمەی گریان، سەرمی دەخستە نێوان هەردوو لەپی گەورۆنەی، دەینووساندم بەسینە و بەرۆکی خنکاو لەژێر بۆنی مێخەک و قەرەنفول، هەردوو مەمکی گەورۆنە و شۆڕ و داکەوتووی هەردوو پەڕەی گوێی منیان دادەخست و زۆر نزیک هەستم بەهەنسکەکانی دەکرد کە لە باوەشیدا توند ڕایتەکاندم، گوێم لە گریانێک دەبوو کە لە قووڵایی دڵییەوە... ناو هەناوییەوە... لە قۆرتی نێوان هەردوو مەمکە شۆڕ بووەکانیەوە تێکەڵ بەڕۆحی مێخەک دەبوو... ئەو ناڵین و بۆنە کاسیان دەکردم، لەوە دەچوو نەنکم بۆ عیشقێکی دۆڕاو لەگەڵ شوانێکی ڕەنج بابردوودا بگری... بەدەم قوڵپی گریانەوە دەی وت:

**«ڕۆحە شیرینەکەم... قەت نەکەی خۆت گیرۆدە بکەی... قەت... سەیری کە چۆن حەکایەتەکانی عەشق بەمەرگ و نەهامەتی و دڵساردی کۆتاییبیان دێ!»**.

بەڵام گریان و ترس و تکای ئەو پەشیمانی نەدەکردمەوە، سیحری حەکایەتەکانی تا ئەوپەڕی دونیای خەیاڵ بردبوومی، گەڕانەوە مەحاڵ بوو، منی شوان خەونم دەدەی زوو گەورەبم... عاشقێکی گەورەی ناو حەکایەتەکانی نەنکم بم... من شوانەچکۆڵەی مێگەلێکی گوێڕایەڵ بووم، بەتەنها بزنە شێتەکەی من بەرۆحی شەیتانێکەوە قەت نەدەسرەوت، بێجگە





لەو هەر هەموو مەڕ و بزنەکانی دیکە جگە لە سەرکزکردن و گیا خواردن هیچی دیکەیان نەدەزانی، هار و سەرکێش منی دەخستە دوای خۆی و مێگەلەکەی بیر دەبردمەوە، هەمیشە هەڵەتە دەبوو، لە ڕاستە ڕێگاکان لای دەدا و هەر بەئەنقەست چوارپەلی لەو قوڕ و خۆڵ و بەردەلانە وەردەدا کە کەوتبوونە هەردووبەری ڕاستەڕێیەکان، شێتی کوێرە ڕێیەکان بوو، توولە ڕێگاکان، هەر پێچپێچێک خوای دەکرد دەچۆوە سەر جەهەننەم، خۆی دەدایە دەست توولە ڕێیەکان، ئیدی دەبوو من واز لە مەڕ و بزنەکانی دیکە بێنم کە دەمزانی تا تەپڵی قیامەت ملکەچانە ئەو ڕاستە ڕێیە بەرنادەن کە ڕێی کەر و بار و پیادە و سوار و هەر هەموو مار و مێرووی ئاوایی بوو، بەیانیان زوو دەبوو ئاگام لە خۆم بێ تا هەردوو پێم لەو تەپکە ڕیخانە نەچەقێن کە هێشتا هالاویان لێ هەڵدەستا، کام کەرتە شاخ و دوند و ڕەوەز بڵند و عاسێ بووایە بۆی هەڵدەشاخا، هەر چوارپەلی بەیەکەوە دەنووساند و دەوەستا، لە چیا بڵندەکان ڕادەما و چاوە زەردەکانی پڕ دەبوون لە هەتاو و لە ئاسمانی دەڕوانی، کە لە دوورەوە سەیرم دەکرد دڵم نەدەهات ئەو وەستانە جوان و شاهانە و پڕ شکۆیەی لێ بشێوێنم، بزنەکەی من چ شێت و پڕ فیز و هەوا و سەرمەست بوو، کە لەسەر گاشەبەردێک دەوەستا هەر دەت وت لەسەر یەک قاچ وەستاوە و... لەشی شێوەیەکی سەیری لە سێگۆشەیەکی ڕەش پێک دێنا کە لەبەر خۆرەتاودا دەبریسکایەوە و تیسکەکانی دەیەها ڕەنگی دیکەیان دەدزی، من دەمزانی زۆربەی شوانەکانی دیکە هەر بەزەبری گۆچان بزنە شێتەکانی خۆیان چاوترسێن کردووە، هەندێ جاریش لەژێر گۆچاندا کوشتوویانن، (سەپان)ی هاوڕێم بەئاهەنگی پاڵەوانێکەوە بۆ شوانەکانی دیکەی دەگێڕایەوە کە چۆن بەزەبری دار کەللەی یەکێک لەو بزنە هارانەی پژاندووە، دەی وت وام کرد کە هەر هەموو تەگە و بزنەکانی دیکە زەندەقیان بچێ، (خدر مالات) قاقای لێ دەدا و دەی وت: من بزنی وا هارم هەبێ سواری دەبم، چەندە خۆی شێت بکا زیاتر سواری دەبم، چەندە ئەو قسانە دڵتەنگی دەکردم،

هەر هەمـــان ئێـــوارە کـــە ڕانەکـــەم ڕادا و لە دوای ئالیک و ئاو و لە تەویلەکردن، هەر زوو چوومەوە ناو باوەشی پڕ لە مێخەک و گریانی نەنکم و تێر گریام، بەر لەوەی لەناو تانوپۆی حەکایەتەکانی ونم کا... پێم وت:

**«نەنێ... ئەمشەو حەکایەتم بۆ مەکە... تۆ دەڵێی شوانەکان هی ئەوەن ببنە عاشق یان پێغەمبەر!»**.

بەقەهرێکەوە سەری ڕادەژەندم و دەی وت:

**«ئەی ئەگەر وانییە؟»**

بەدەم قوڵپی گریانەوە وتم:

**«نا... وا نییە نەنێ... وا نییە... شوانەکانی ئاوایی بزنەکانیان دەکوژن و...»**.

نەموێرا و شەرمم کرد تەواوی بکەم و قسە بێزەوەرەکەی «خدر مالاَت»ی بۆ بگێڕمەوە... و دامە پرمەی گریان.

بەحیکمەتی پیرەژنێکەوە وتی:

**«ڕۆڵە شیرینەکەم... لەناو شوان و گاوان و سەپانەکانیش باش و خەراپ هەن»**.

چەند جارێک و ئیدی خۆم لە شوانەکانی دیکە دەدزییەوە، بەلاقرتێوە پێیان دەوتم:

**«مەکتەبلییە... بێزی نایە!»**.

من بێزم لە قسەکانیان دەبۆوە، بەدڵڕەقییان دڵتەنگ دەبووم، بزانیایە لە کام مێرگ و پاوان و لێرەوارن... توخنی ئەو شوێنانە نەدەکەوتم، تەنیایی کردمی بەکارامەترین شمشاڵژەن، نەوایەک لە ڕۆحم هەڵدەستا کە بزنە شێت خامۆش بکا، ئیدی نائومێد بووم لەو هاوەڵانەم کە ببنە عاشقی گەورە یان پیاوی میهرەبان، من دەمدی چۆن بەگۆپاڵ ڕاوەدووی مەڕ و بزن و چوشتیر و تەگەکانیان دەنا، چۆن تیغیان لە گەردنی مەڕ و بزنەکان هەڵدەسوو... نا... لەوە چڵکنتر بوون عاشق بن.

بەپێچەوانەوە... من چەندە ئەو بزنە سەرسەخت و لە ڕێ لادەرەی خۆم





خۆش دەویست، کردم بەپێشەنگی مێگەل و زەنگوڵەم لە ملی کرد، هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە کە بردمیانە قوتابخانە من بەخەیاڵ هەر لای بزنە شێتەکەی خۆم بووم، چەندە بێ ئاگابووم لە (دارا دوو داری دی)، لە کۆکردنەوە و دابەشکردن و لێک دەرهێنان، دەمخواست نیوەڕۆبێ و زوو بگەڕێمەوە ناو ڕان، هەمیشە ئەلف و بێ و ماتماتیکەکەم لەگەڵ خۆم دەبرد، جارێکیان بێ ئاگا لە خۆم بزنە شێت سێ لاپەڕەی ئەلف و بێیەکەی دڕی، هەروەک پێم بڵێ:

**«دە فڕێی دە و... دوام کەوە!»**

هەموو لاپەڕەکانیشی خواردبا دڵم نەدەهات هیچی لێ بکەم، بەدەم لەوەڕاندنی مێگەلەوە سەرگەرمی موتالاَ و دەرس و دەورەکەم دەبووم، کەچی لە ناکاو ماڵ و مەکتەب و مێگەل و هەموو دونیای لەبیر دەبردمەوە... بزنە شێت دەیخستمە دوای خۆی... ها لێرە و ها لەوێ... هەر ڕۆژە و شتێکی تازەی پیشان دەدام: بن گاشەبەرد و سەرکانی و ئاوی وا لە ژیانما نەمدیبوو، دوای دەکەوتم و لەپڕ خۆم لەناو ئەشکەوتێکی تاریک و شێدار و سامناک دەدۆزییەوە کە بۆنی سارد و تکەی ئاوی ڕژاو بەسەر سەر و ملما خەنی دەکردم، یان لە ناکاو خۆم لەنێو نێرگزەجارێکدا دەبینییەوە کە پێم سەیر بوو لەو هاوینەدا ئەو هەموو نێرگزە لەبەر پێیانم بلاَون، کە لە ماڵەوە دەمگێڕایەوە، یان کە دەمویست هاوپۆلەکانم سەرسام بکەم هەمیشە بەدرۆزن لە قەڵەمیان دەدام، لە پێچێکی دیکە و لە نزارێکی دیکەدا بەگوڵە ماست و پەلەزێ و شلێر و مێلاق و کنێر و گوڵە فەقێ و سومبول شاگەشکەی دەکردم، چەپکێکم لێ دەبەست و دڵی (شیرین)م پێ خۆش دەکرد و بۆنی بەهارم دەبردەوە ناو ئەو پۆلە ساردەی خۆمان، هەر بزنە شێت دەیبردمەوە ناو مێرگێکی پڕ لە کاردی و قوڕادە و سێ بسکۆڵە و ئەسلێرک و قەلەندۆر و گۆرمزە و گێزبەل و ترشۆکە... دایکە و نەنکم پێ خەنی دەکرد، کە هاوپۆلەکانم بە«فەرەفیشاڵ» ناوزەدیان دەکردم... بەغەزەبی کەسێکی ڕاستگۆوە دەموت:

**«ئەگەر غیرەتتان هەیە ئەم نیوەڕۆیە وەرن و دوای من و بزنە بۆر کەون!»** .

تەنها کەسێک لە ماڵ و لە مەکتەب کە بڕوای پێ دەکردم (شیرین) بوو، لەگەڵ خەیاڵەکانی مندا بەرز دەفڕی، ئەم تاکە کەسێک بوو گەر درۆشم کردبا بەڕاست لێمی وەردەگرت، بەدزییەوە پێی دەوتم:

**«ڕۆژێک دێم و دەکەوینە دوای بزنە شێت... خەم بەو منداڵانە مەخۆ...»**

هەمیشە خۆی بەسەرەژن دادەنا، بەچاو و دەم و دەست دەدوا، جگە لەو کەسێکی دیکە نەبوو گوێ لە چیرۆکی پڕ لە سەیر و سەمەرەی من و بزنەکەم بگرێ، ڕۆژ بەڕۆژ لە شیرین ورد دەبوومەوە، پەرچەمی جوان بڕاوی سەر ناوچەوانی، چاوەکانی، ڕەشتاڵەیی ڕوخساری و هەردوو باسک و بەلەکی، چوارپەلی کورت و تووکنی: کتومت لە بزنەکەم دەچوو، فیز و هەواکەی، جورئەتی لە ڕادەبەدەری، هەر کە زەنگ لێی دەدا لەو گۆڕەپانە پڕ لە زیخ و چەوەدا ڕاوەدووی کوڕ و کچەکانی دەنا و کەس لە غارغارێن پێی نەدەگەیشت، زۆرانێی لەگەڵ کوڕەکان دەگرت، بزێوترین و ژیکەلانەترین کچی پۆلەکەمان... کە پێم دەوت تۆ لە بزنە شێت دەچی، بەمەکرەوە دەخەنییەوە و دەی وت:

**«دە بمبە»** .

نەمدەوێرا... دایکم دەی وت نابێ ئەوەندە کچانی بیت و کیژی دەرودراوسێ مەخەرە دوای خۆت بۆ ناو ئەو شاخوداخانە، چەند جارێک لە تەویلەدا... لەبەردەمی ماڵێدا بزنەکەمی دیبوو، بەس مەراقی بوو بزانێ کەوتنە دوای بزنێکی شێت لەناو ئەو چیا و چۆڵەدا چۆن چۆنییە، ئەو هەموو ڕێکەوتە جوانە چییە کە ئەو ئاواهی پڕ تەماع دەکا، من لەوە بێ غیرەتتر بووم هانی بدەم، تا پاش نیوەڕۆیەکی خۆشی بەهار بوو وەک فریشتە لەسەر گاشەبەردێک دابەزی و... من لە خۆشی و ترسانا دڵم داخورپا... بەخۆی و چەقۆی دەستییەوە لەژێر هەتاودا دەبریسکانەوە، عەکسی تیشکی سەر دەمی تیغەکە چاوانی پێ دادەخستم... وتی:





**«بەبیانووی کەنگرکردنەوە هاتم»** .

بەجووتە، شێتانەتر لە بزنەکە ڕامان دەکرد، دەیویست بیبەم بۆ لای ئەو شانە هەنگەی کە لە ناو کلۆری پیرە دارگوێزەکەی سەر خەرەند دۆزیبومەتەوە... بردم، ناو هەناوی داکەوتووی دارەکە پڕ بوو لە هەنگوینی مەییو، پەنجەی دۆشاومژەی تیا بزر دەکرد و بەتامێکەوە دەیخستە سەر زمانی شەقار شەقاربووی، بۆ لای ئەو تووتڕکە دەستیم ڕاکێشا کە لەژێریدا ئەو هەموو شلیکە خوێناوییە خۆیان لە چاوان شاردبۆوە، کە بردمە سەر لاتێک لە قوڕادە و پیفۆک و گێزبەلە کە ئەم حەزی لێ دەکردن؛ خۆی تیا دەگەوزاند، کە حەکایەتی ئەو خۆشێتکردنەم بۆ نەنکم گێڕایەوە... پێی وتم:

**«باوکی شیرین پێ بزانێت، بەیەک گوللە سەرت هەڵدەگرێ... خۆت دەزانی چ پیاوێکی دڵڕەقە!»** .

دەمزانی نەنکم ڕاست دەکا، هەموومان حەکایەتی جەرگبڕی خوشکەکەی شیرین-مان دەزانی کە چۆن باوکی هەڵیداوەتە ناو خەرەندەکە و کەس لاشەکەی نەدۆزیوەتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی لەسەربان وەختی هەڵخستنی جل بەتەنافەوە چاکوچۆنی لەگەڵ کوڕە دراوسێیەکەیان کردووە. چەندە حەزم دەکرد لە پۆل لە تەنیشت شیرین-ەوە دانیشم، نە لە پۆلی یەک و نە لە دوو و نە لە سێ نەیان هێشت، نەمدەویست کچانی بم، خەونم دەدی ڕۆژێک بێ و هەردووکمان گەورەبین... دوور لە ڕاستە و چاوسوورکردنەوەکانی مامۆستاکان، شەپازللەکانی باوکم، لەو تەختە ڕەقەی ژێرمان، لەو تەختەڕەشە ڕەنگ بواردووەی هیچی لەسەر نەدەنووسرا، لە وێنەکانی مرۆڤی (نیاندرتاڵ) بەسەر سەرمانەوە کە چۆن بۆق دەخوات... من کە خۆم بەفەرهاد-ی ناو حەکایەتەکانی نەنکم نەدەگۆڕییەوە چیم دابوو لە هەڵمژینی تۆزی تەباشیر؟ چەندە خەونم دەدی زوو گەورەبم و... من و شیرین و بزنە شێت لە ئەشکەوتێکدا بژین... بەتەماعی ئەوەی منی شوان و عاشق ببمە پێغەمبەر، مەکتەب لێ نەدەگەڕا نە ببمە فەرهادی عاشق، نە شوان و... نە پێغەمبەر، چ خۆش بوو کە مامۆستای وەرزش بازنە بازنە لە

گۆڕەپانەکە پەرتی دەکردین، بەخەنینێکەوە کە دەیخنکاندم چاوم لە چاوی شـــیـــرین دەبڕی، چ زوو زەنگ لێی دەدا و لە خـۆشی گــەمـــە و بەزمی حەقلەشەلێ و سابوونا ڕەقێ و هەلیکسێ و چاوشارکێ و پێنجوکانێ و شینەومینە و مامەسووڕانێ و بازدانێ و حێلانێیان دەکردین... وەی خودا هاوار چەندە حەزم لە گەمەی گورگ و مەڕ بوو، کچەکان دەبوونە دایکمان و هەندێک لە کوڕە هارەکان دەبوون بەگورگ و چکۆڵە و جیقنەکانی وەکو منیش دەبووین بەمنداڵ، هەمیشە شیرین-م دەکرد بەدایکی خۆم و دەبوو هەر کوڕە لە پشت دایکییەوە خۆی حەشاردا، هەردوو دەستم دەخستنە سەر ئێسکبەندی زۆر ناسکی خوار کەمەری:

دایک: **کوڕەکەم... ماڵێ چۆل نەکەی.**

منداڵ: **هۆ... دا... ئەتوو چ دەکەی؟**

دایک: **دەچمە دارا.**

منداڵ: **ئەمنیش دێم**

دایک: **گورگ دەتخوا**

منداڵ: **وی... نایەم... نایەم**

گورگ: **ئاغا هاتییە بۆ مەڕەکی**

دایک: **بەخوا نابیا قشپلەکی**

پەلامـاری گـورگم دەکـرد بەبیـانوو، دەنێـو قـاووقـیـژ و ترس لە گـورگی لەعنەتی باسکم لەناو قەدییەوە وەردێنا و بەیەکەوە ئەو ناوەمان گێرە دەکرد و من بابەخولەم بەشیرین دەکرد، بەیەکەوە بەردەبووینەوە و هەڵدەستاینەوە، خودایە... شیرین چەندە لە دایکێکی ئازا و هار دەچوو... نەیدەهێشت کەڵبە تیژەکانی گورگەکە بمگاتێ...

دایک: **لاکەوە و نەیەیتە پێشێ...**

گورگ: **ناگەڕێمەوە و پەلامار دەدەم...**

دایک: **ئەمنیش پەرژینان دەکەم...**

گورگ: **من برسیمە و... خەراپی دەکەم...!**





لە دە جاران... جارێکیان گورگە پەرژینەکەی تێک دەدا و منی دەخوارد... شیرین بەدیارمەوە دۆش دادەما و چاوەکانی پڕ دەبوون لە گریان، هەروەک بلێیی بەڕاستی خورابم، خۆم مـات دەدا و دەمردم، یەخەی کورتەکـەکەمی دەگرت و شپـرزە و پەرێشـان دایدەتەکـاندم، کـتـوپڕ چاوەکـانم دەکـردەوە و لەگەڵ فیـکەی مـامۆسـتـا ڕاست دەبوومەوە... چ خۆشییـەکی کورت و کەم خـایەن بوو... دوای ئەو سـوعـبـەت و کـەیف و گـەمـەیە مـامۆسـتـا (یونس) دەهاتە ژووری و پۆلەکــەی لێ دەکــردین بەجــەهەننەم، لە ترسی مــار و دووپشـک و ئاگـری دۆزەخ و گـوناهی دایکە حەوا و بـاوکـە ئادەم دەبوو تا تەقـینەوەی قـوڵپی گریـان لە دڵدا هەر هەمـوومـان غـەمگین بین، بەخـۆی و سێـوە ڕزیوەکـەی ناو دەستـی دەهاتە ژووری و باسی لـەو بەهەشـتـە خـۆشـە دەکرد کە بەفریوی دایکە حەوا دۆڕاندمان، ئاگری دۆزەخمان کرد بەماڵمان، لەو هەمـوو ناز و نیـعمـەتە بێ بەرییـان کردین، لەو بەهەشتە خۆشەی پڕ لە مـیـوەجـات، لەوێ کـە نە سـەرمـامـان دەبوو... نە گـەرمـا... پڕ بەپۆلەکـە دەینەڕاند و هەمووومانی دەتـۆقاند... ئاخر بۆ بەگوێی شەیتانتان کرد؟ وەی... وەی... لەو گـوناهەی تا ئەبەد ڕووی ڕەش کـردین... ڕسـوای کـردین... بەهەر چوار دەوری خۆیدا خـولی دەخـوارد و تفی لێ دەکردین... وەک ئەوەی ئێمـە هەم شـەیتـان و هەم ئادەم و حەوای گـوناهبـار بین... هەر هەمـوو شـتـێکی لێ حەڵاڵ کـردن... خـودای تەبارەک وەتەعـالا فـەرمـووی: لەو درەخـتـە مـەخـۆن... ڕۆڵەکانم... شەیتـان لە بەرگی مارێک یان تاوسێکدا بوو... نازانم... هات و چرپـانـدی بەگـوێـی حـەوادا... حـەوا-ش چرپاندی بەگـوێی ئادەم-دا... ئیـدی لەو ڕۆژەوە... لەو سـەعـاتەوە ئێـمە بەر لەعـنـەتی خودا کـەوتین... هەر جارە و کوڕ و کـچـێکی بانگ دەکردە بەردەم تـەختـە ڕەشـەکە و تـرسنۆک و ڕسوا و گـوناهبـار ڕووبەڕوو لەبەردەمی ئێـمـەدا دەوەسـتـان: دەبوون بەئادەم و حـەوا، کچێکی دیکەی بانگ دەکرد و پێی دەوت:

«**تۆ ببە بەدرەختە حەرامەکە**».

چەنـدەهـا جـار وا ڕێـک دەکـەوت من ببم بەباوکــە ئادەم و شـیــریـن-یش

دایکە حەوا، بە چ ترسێکەوە بەگوێی مندا دەیچرپاند کە قەپاڵ لە سێوە ڕزیوەکەی مامۆستا یونس بگرم و بیخۆم، کتوپڕ مامۆستا هاواری دەکرد و ڕووی لە کوڕ و کچەکانی دیکە دەکرد و دەی وت:

**«هەر هەمووتان هەستنەوە و دەستەکانتان هەڵبڕن و ببنە درەخت و شنەشن خۆ بلەرێننەوە»**.

پاشان لە شیرین-ی دەخوڕییەوە کە وەک حەوا لە خشتەم بەرێ... ئەویش بە چ خەمێکەوە لێم دەپاڕایەوە:

**«ئادەم گیان... لەبەر دڵی من ئەو سێوە بخۆ!»**

هەندێک جار، لە ترسی هاوار و نەعرەتەی مامۆستا یونس، کە فەرمانی خواهانەی دەردەکرد کە دەبێ شیرین لەوە ناسکتر فریوم دا، سەری لێ دەشێوا و بەچرپەیەکەوە کە بیخنکێنێ دەی وت:

**«فەرهاد گیان... لەبەر خاتری من لەم سێوە بخۆ!»**

ئەمجارەیان بەسەر هەردووکماندا دەینەڕاند"

**«ملۆزمینە... هیچ و پووچینە... ئێوە ئێستا ئادەم و حەوای گوناهبارن... شیرین و فەرهاد نین...!»**

هەمیشە (زرار)ی دەکرد بەشەیتان و ئەویش بەدەنگە گڕەکەی بەگوێی حەواکانی پۆلەکەماندا دەیچرپاند، تەنها یەک ڕۆژ زرار وێرای بپرسێ:

**«مامۆستا بۆ جارێک منیش ناکەی بەئادەم؟»**

توند گوێی بادا و بستێک لە زەوی پێی ڕاستەی پێ بەرز کردەوە و پێی وت:

**«چونکە خۆت ئیبلیس-ی»**

دەبوو (زرار) شەیتانانە فریومان بدا و سێوە ڕزیوەکەی مامۆستا یونس-مان لە لا خۆشەویست بکا و دەستی بۆ ئەو کچە درێژ دەکرد کە لارەمل دەوەستا و هەردوو دەستیشی ڕووەو ئاسمان بەرز دەکردەوە و خۆی دەکرد بەدار سێوی حەرام...

**«ئەها لەو سێوە لا سوورانە... ئەها لەو بۆن و ڕەنگەی... وەی وەی... ئێوە**





**تامی کەن... گەر بیخۆن تا ئەبەد نەمر دەبن و لەم بەهەشتەدا دەمێننەوە»**.

پاشان کە بەترسەوە قەپم لە سێوەکە دەگرت، ئەو سێوەی لە دە لاوە جێی قەپی هاوپۆلەکانی بەسەرەوە بوو، لە ناکاو مامۆستا یونس خواهانە فەرمانی پێ دەکردم کە نەیخۆم دەنا بەر لەعنەتی خودا دەکەوم، بەدەم هاوار و قیژەوە دەچووە سەر یەکێک لە کورسییەکانی پێشەوە و دەینەڕاند:

**«مەلعونینە مەیخۆن... لێ حەرام کردوون... مەیخۆن...!»**

دەبوو (زرار) بڵێ:

**«ئەوە چییە... دەترسن...؟ دەک داوەشێن، خوا حەزی لە سوعبەتە... ئەها ڕەنگی... ئەها بۆنی... دە ئێوە تامی بکەن»**.

دەبوو زوو زوو شیرین دووبارەی بکاتەوە:

**«دە دەی ئادەم گیان... دڵم مەشکێنە... دەنا دەتۆرێم...»**.

کە کەڵبەم لە سێوەکە گیر دەکرد و کرمەیەکی نەرم دەمی من و هاوەڵەکانمی پڕ دەکرد لە ئاوێکی تفت... مامۆستا یونس دەی وت:

*«ئەها سەیری کەن... ڕۆڵەکانم... چەند بەئاسانی بەهەشتمان دۆڕاند، ئەگەر گوناهی دایکە حەوا و باوکە ئادەم نەبووایە تا ئێستاش هەر هەموومان لەوێ دەبووین، چونکە، لەوێ لەو مەلەکوتە مەرگمان نەدەبینی، سەیری کەن ئێمە لە چ گوناهێکی گەورەوە پەیدا بووین!»*.

مامۆستا بەوەوە نەدەوەستا، بەدەم غەزەبی خودایەکەوە هەموو گیانی دەلەرزی و دەیقیژاند بەسەرماندا:

**«بۆ دەرەوە هەی مەلعونینە... ئەم بەهەشتەم لێ پیس مەکەن!»**.

بەدەم ترسێکی گەورەوە و قریوە و قاقایەکی خنکاو لە قورگدا وەک ئادەم و حەوایەکی گوناهبار و سەرکز دەچووینە دەرێ و هەوای پاکی دەرەوەی پۆلمان هەڵدەمژی تا زەنگ لێی دەدا و تێکەڵ بەهەراوهۆریای هاوپۆلەکانمان دەبووینەوە.

هەمیشە من و شیرین لە پەنای شوورەی بڵندی قوتابخانە دوو بەدوو قسەمان دەکرد، ئەو دەترسا و باسی گوناهی دایکە حەوا و سێوە

حەرامەکەی بۆ دەکردم، منیش باسی بزنە شێت و گیا حەرامەکانی لا ڕێگاکانم بۆ دەکرد، مامۆستا یونس بەوەش نەدەوەستا و ماوەیەک فێری کردین کە گوناهبارانە لەبەر دەرگای پۆلەکە بوەستین و وەک ئادەم و حەوایەکی شەرمەزار کە چۆن چۆنی لەبەر قاپی داخراوی بەهەشتدا وەستان و گریان و پاڕانەوە، خودای تووڕە و داخداریش دەری کردن، ئاواهی من و شیرین و هەر هەموو ئادەم و حەواکانی پۆلەکەمان دەبوو زمان بەدەرگاکە دابهێنین و بپاڕێینەوە و بگرین، مامۆستا درزێکی دەخستە دەرگاکە و تفێکی لێ دەکردین و دەی وت:

«**بڕۆنە دەرەوە هەی کافرینە**».

مامۆستا یونس بەوە نەدەوەستا و لە هەموو دەرسێکدا بەترسەوە هەموو کچەکانی لە دوو ڕیزی پێشەوە کۆ دەکردەوە، پاشان بەپەلە و شپرزە دەی وت:

«**نەء... با کچەکان لە ڕیزی پشتەوە دابنیشن و ئێوە وەرنە پێشەوە**».

لە هەندێک بەیانیاندا لە بری چەپکێک گوڵ و ڕەیحانە، سێوێکم دەهانی لاسایی مامۆستام دەکردەوە و شیرین-یش قاقا پێدەکەنی.

«**ها... حەوا گیان... سێوەکەت تفتە و ناخورێ!**».

منداڵانی دیکە بەدەم قریوەوە پێیان لە زەوی دەکوتا و خەنی دەبوون.

هەمیشە لە دوای ئەو گەمە ناخۆشەی (ئادەم و حەوا) شیرین بۆ دوو سێ شەو خەونی بەدۆزەخەوە دەبینی، بەدەم لەرز و تاوە لە جێگادا دەکەوت و دایکی بەدایکمی وتبوو کە بەدەم خەوەوە وڕێنان دەکا، هەمیشە دوای هاتنەوەی بۆ مەکتەب من دڵم دەدایەوە، یەک باوەش گوڵ و ڕەیحانەم دەهانی و دەموت:

«**ئەها پۆلەکەمان دەڵێی گوڵزاری بەهەشتە!**».

زرار-ی ئیبلیس دەی وت:

«**نا... نا... گوڵزاری گووە!**».

هەر بۆ دڵخۆشکردنی (شیرین) ناو کتێب و دەفتەرەکانیم پڕ دەکرد لە





پەڕەی گوڵ، دەمزانی کە دەچێتەوە و لاپەڕەی کتێب و دەفتەرەکانی هەڵدەداتەوە، لەگەڵ بینینی هەر پەڕەی گوڵێک دڵە ساواکەی دادەخورپێ و کەمەکێ خەنی دەبێ... هیچی دیکەم پێ نەدەکرا، ناو لاپەڕەکانی کتێب و دەفتەرەکانی، ناو جانتاکەی، گیرفانەکانی پڕ ببوون لە پەڕەی گوڵە مردووەکانی من، ئەوەندەم گوڵ بۆ دەهێنا پۆلەکەشمان بۆنی تێکەڵی گوڵە کێوییەکانی گرتبوو... سەروپرچی، دەست و پەنجەکانی بەمەکرەوە گوڵەکانی بەکچەکانی دیکە پیشان دەدا، کچی بەڕێوەبەر و کوێخا سمایل بەچەپک، لە داخی شیرین، لە باخچەکانی خۆیانەوە گوڵیان دەهێنا بەگوڵە کێوییەکانی من بەراوردیان دەکرد، شیرین بەفیزێکەوە، بێ باکانە دەی وت:

«**نەتان کردبێ... گوڵەکانی من جوانترن!**».

ئەی خودا چەندە حەزم دەکرد هەتا زووە گەورە ببم و کێوی بێستوون کون بکەم و کانیاوێک لە شاخان بتەقێنمەوە، بەسەر فێڵی پیرەژنی عفریت و شەڕانگێز و فەرهاد کوژەدا زاڵ بم، بەبەرچاوی هەر هەموو ئاواییەوە دەست لە ملی شیرین بکەم؛ بەدیار تەقینەوەی کانی لە شاخدا و خۆشی ئاوایی خۆمان کە سەری چەند ساڵە هاوار و ناڵەیانە و دەڵێن: وشکە ساڵە، مەڕ و بزنەکان، ژن و پیاوەکان، کەر و مانگاکان، هەر هەموو فڕندە و پەلەوەرەکان، هەرچی مار و مێرووی ژێر خاک هەن ئاو بخۆنەوە، درەختەکانیش سەوز ببنەوە، بەبەر چاوی هەموویانەوە بڵێم: ئەوە منم کە سەوزایی و خێر و فەڕ و بەرەکەتم بۆ هێناون... هەر بۆیە هاتووم شیرین لە ئێوە بخوازم... ئەوانیش هەر هەموو... بەباوکی شیرین-یشەوە پێم بڵێن:

«**پیرۆزە و... حەڵاڵە!**»

هەمیشە لەژێر سێبەری درەختەکان و بەدەم لەوەڕاندنی مەڕ و بزنەکانەوە ئەو خەونانەم دەدی... دەشتەرسام باوکم، باوکی شیرین، دایکم، مامۆستاکانم، هاوپۆلەکانم، شوانەکان بەنهێنی ئەو خەونانە بزانن و ڕسوا بم... ئەو ڕازە شەرمنانەم لە دڵما دەشاردەوە نەبا پێم پێ بکەنن، شەوانە

بەدزییەوە دەمبردنە ژێر لێفەشڕەکەم، بەتەنها بۆ بزنەشێتم دەگێڕایەوە، هەرچی ڕاز و نیازی دونیا سەیرەکەی خۆم و بزنە شێتیش هەبوو بۆ شیرین-م دەگێڕایەوە، هەندێک بەیانی زووتر لە هەموو قوتابییەکان دەهاتین، وەک ئادەم و حەوایەکی چکۆڵە و گوناهبار خۆمان لە چاوی بەڕێوەبەر و مامۆستا و قوتابییەکان دەشاردەوە، لە ترسی ئەوەی نەبا مامۆستا عوسمان بەحەیزەرانەکەی ناولەپم ئاگردا، شیرین ئارەقەی شین و مۆری دەردەکرد تا خشتەی لێکدانەکەم پێ ئەزبەر بکا... بەترس و قەهرێکەوە... فسەزمانانە دەی وت:

**«واذ لە بذنە شێت بێنە... خشتەی لێکدانەکە ئەذبەر کە!»**.

هەر جارێک هەردوو ناولەپی سوورهەڵگەڕاوم بەشیرین پیشان دەدا، فرمێسک دەزایە هەردوو چاوە ڕەشەکانی، خودا گیان... چەندە خۆش بوو کە بۆم دەگریا و بەزەیی و سۆزم لە چاوەکانیدا دەخوێندەوە... من دەمزانی چەندە تەمبەڵم: نە سردووەکانم پێ ئەزبەر دەکران، نە خشتەی لێکدانەکە و نە فاتیحاکە... جگە لە شیرین کە دڵی نەدەهات، هەر هەموو دونیا پێی دەوتم:

**«تەمبەڵ... تەوەزەل!»**.

من دوژمنی مامۆستا عوسمان و ماتماتیک بووم، چەندە خۆش بوو کە ڕقیم هەڵدەستاند... من دەمزانی گەر من ئەوەندەی تر خۆم گێل و تەمبەڵ نەکەم، ئەوە بێجگە لە من شوان و سەپان و شێرۆ-ش دارکاری دەکا، نازانم بۆ هەمیشە لە دەرسەکەی ئەودا من خەیاڵم هەر لای بزنە شێت بوو، دەیزانی کەی خەیاڵم دەڕوا... ئەو کاتە هەڵی دەستاندم... هەمیشە خشتەی لێکدان و یان دابەشکردنە لەعنەتییەکە بوو... بەیانییەکی زۆر ساردی زستان بوو، دوا وانە و خۆشی ئەوەم بوو زەنگ لێ دەدا و هەر تاوێکی دیکەیە و دەگەمەوە لای بزنەشێت و مێگەل ڕادەدەم...

ژمارەیەکی زۆر درێژی نووسی... دابەشی کەم بەسەر نۆدا، دەشیزانی کە نایزانم...





**«هەستە... کوڕی کەر...!»**.

هەستام و بێ خەیاڵ و ملهوڕ و بێ باک لە ژمارە درێژەکە ورد دەبوومەوە، پاشان دوو کوکوختی سەر درەختەکەی پشت پەنجەرەکە پتر خەیاڵیان بردم، نێرەکە شێتانە باڵی لێک دەدا و قەستی بوو هەتا زووە بەسەر مێیەکەدا بتسێ، لە گوڕی بای دەوری باڵەکانی پەڕی باڵەکانی و گەڵاکان دادەکەوتن، کە زانی من سەرنجی هەموو قوتابییەکانیشم بۆ لای کوکوختییەکان ڕاکێشا و بێ ئاگام کردن لە دابەشکردنەکە، لە ڕقانا هەردوو لا لێوی کەفیان دەردا و یەک شەقی لە قوونم هەڵدا و بەتەختەڕەشەکەی وەنووساندم، لەگەڵ زرمەی شەقەکە هەردوو کوکوختییەکەش گێژ و زەندەقچوو لێک بوونەوە و فڕین بەئاسماندا... عادەتی میز تا ڕان و بەلەک و ناو پێڵاوەکانی تەڕ کردم... هەردوو دەماری لاملی ڕەپ بوون و وەکو ئەسپێکی ماندوو لە غاردا هەردوو پەڕەی ئەستووری لووتی بەلەرزە لەرزە کەوتن، پرسی:

**«سەگباب... تۆ شوانی چەند مەڕ و بزنانی؟»**

بەدەم هەنسکەوە وتم:

**«شەست... پەنجا... چل... سی... نەء... بوەستە مامۆستا... بەبزنە شێتەکەوە چل و چوار... یان چل و پێنج»**

شێتانەتر پرسی:

**«چل و چوار... یان چل و پێنج؟»**

شپرزەتر و داماوتر وتم:

**«چل و هین... چل هین...!»**

تفێکی لێ کردم، ویستم بیسڕمەوە...

**«چل و گۆڕی باوکت... نەکەی... ئەو تفە نەسڕیتەوە... حەیوان... ئەو بزنە شێتە بۆ جیا دەکەیتەوە؟»**.

شەپازللەیەکی لە ناکاوی سراوەندە ناو دەمم و بۆکسێکی خێواندە پشتی سەرم کە وەها توندبوو پۆلەکەی لەبەرچاو تاریک کردم... لە ترسانا... بەپەلە

و بەدرۆ وتم:

**«چل و پێنج!»**

پتر لێم هاتە پێشێ و بەسەرمدا نووشتایەوە... بەرقێکی زۆر ئەستوورەوە کە لە جەهەننەمەوە هاتبێ پەڕەی ناسکی گوێ ڕاستەمی خستە نێوان پەنجەی گەورۆنە و پەنجەی شایەتمانەی، وەها توند بای دەدا کە ئیدی تەواو کوێری کردم، تاڵییەک وەک ژەقنەبووت قورگی گرتم... نەمدەویست لەبەرچاوی شیرین و هاوپۆلەکانمدا بدەمە پرمەی گریان، لەوەدا بوو برشێمەوە، هەستم دەکرد لەگەڵ هەر گوێ بادانێک ڕیخۆڵەکانم سواری یەکدی دەبن... سەروبن گەدەم تێک هەڵدەهات... بێ باکانە پرسی:

**«لە ماڵەوە چەند کەسن؟»**

بەدەنگێکی نووساوەوە، دیسانەوە، ژمارەکانم تێکەڵ کردەوە:

**«حەوت... نەء... هەشت... بەمنەوە نۆ... نەنکم...»**.

قوتابییەکان بەدەم ترسەوە، لە ژێرەوە و بەدزییەوە دەخنکان، قەستیان بوو بەدەم تەقینەوەی قاقایەکەوە یان قوڵپی گریانێکەوە بنمیچەکە هەڵبگرن... نەیان دەوێرا... من دەمزانی کە تاکە کەسێک (شیرین)ە بەدەم گڕی ژانێکەوە، قەهرێکی قووڵەوە، قەهری دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی بۆ یەکدی لە من دەڕوانێ و لەژێرەوە دەگری... نەمدەزانی کەی پەڕەی گوێم بەردەدا... زۆری خایاند تا پرسی:

**«ئەگەر ئەو چل و پێنج سەرمەڕ و بزنە بەسەر هەر نۆ کەسەکەی ماڵی خۆتاندا دابەش بکەی... هەر یەکەتان چەند حەیوانی بەردەکەوێ... حەیوان...؟»**.

وەها شپرزە و سەرلێشێواو بووم... پێم وت:

**«مامۆستا... هین... دابەشی ناکەین... هی خۆمانە!»**.

خودا هاوار مامۆستا عوسمان کتوپڕ پێکەنی، قوتابییەکانیش پێکەنین، جگە لە شیرین، چونکە من پێکەنینەکەی ئەوم دەناسییەوە، لەناو دەیەها کچ قریوەکەی ئەوم جیا دەکردەوە... مۆڕەیەکی لێ کردن... هەر هەموو





خامۆش بوونەوە... بێ باکانەتر لە جاران وتی:

**«لە بزنەکەت شێتتر وا بزانە هەریەکە و چەند مەڕ و بزنێک دەباتە لەوەڕێ!»**.

وام زانی ڕزگارم دەبێ گەر بڵێم:

**«مامۆستا... ئاخر نایەوێ... چونکە دوای مەکتەب خۆم دەیانلەوەڕێنم!»**.

لە گەرمەی ئەو پرسیار و وەڵامانەدا بووم کە دیسانەوە هەردوو کوکوختییەکە بەفرەفڕی باڵە ماندووەکانیانەوە هاتنەوە ناو باوەشی درەختەکە... لەوە نەدەچوو هێشتا بەسەریدا تسیبێ، نەیهێشت ڕوو وەرگێڕم و لەو بێ ئاگا لە کوکوختییەکان ڕابمێنم، بەدزییەوە یەک دوو جار ئاوڕم دایەوە، چلاو چڵ نێرەکە دوای مێیەکەی دەکەوت و نەیدەهێشت بسرەوێ، ئیدی دوا قسەی من شێت و هاری کرد... بەپەلە قوتابییەکی نارد تا حەیزەرانەکەی بۆ بێنێ، شێتانە هاواری کرد:

**«کەر کوڕی کەر ئاسانترین دابەشکردن نازانیت... بەشەرەفم دەتکەم بەبەشەر!»**.

بێ پێوتن هەردوو ناولەپم بۆ کردەوە، حەیزەرانەکەی تا بنمیچەکە هەڵدەبڕی، حەیزەرانەکە هەوای شەق دەکرد و وژەوژی کاسی دەکردم، هەر هەتا شەشەمین حەیزەران زەحمەت بوو... ئیدی دوای ئەوە دەستەکانم هی من نەبوون، کتوپڕ زەنگ لێی دا... دەنا سوێندی شەرەفی خواردبوو کە چل و پێنج حەیزەرانم لێ بدا کە دەکا ژمارەی مەڕ و بزنەکانم... شەو هەردوو لەپم بەسوێ دەکەوتنەوە و وام هەست دەکرد کە دوو پشکۆ لەناو لەپما قرچە قرچ گۆشت و ئێسقان بەیەکەوە دەسووتێنن، شەو لە تاو ژانی هەردوو دەستم دەگریام، نەنکم گوێی لە هەنسکی شاراوە و خنکاوم بوو لەژێر لێفەکەوە... نەمدەویست کەس پێی بزانێ، خۆی پێ نەگیرا و زوو زوو دەیپرسی:

**«ئەوە تۆی دەگری... ڕۆڵە!»**.

من هەر هەنسکم هەڵدەدا، کت و کوێرانە لەناو پێخەفەکەوە بەدارەدار

هاتە دەرێ و فتیلی فانۆسەکەی بەرز کردەوە، کە فانۆسەکەی لە ڕوخساری تەڕم نزیک خستەوە، تەڕ و غەریقی فرمێسک، هاوارێکی خنکاو لە قورگیا تاسا، بەسەرمدا گریا و هەزار دوعای مەرگی لە مامۆستا عوسمان کرد، بەشێنەیی ناو هەردوو لەپمی بەڕۆنە گەرچەک چەور دەکرد، زوو زووش بەگڕی دانەمرکاوی زۆپاکە پەڕۆی گەرم دەکرد و دەیخستە سەر هەردوو دەستم و پەنجە هەڵتوقیوەکانم... سفتوسوێی ناولەپم و پەنجەکانم کەمتر دەبۆوە، ویستم لە گریان ژێری بکەمەوە... بۆیە پرسیم:

«**نەنێ... ؟**»

«**نەنێ بەقوربانت بێ!**».

«**ڕاستە باوکە ئادەم و دایکە حەوا لەسەر سێو خواردنێک کە خودا لێی حەرام کردوون لە بەهەشت دەرکراون؟**».

«**سێوی حەرامی چی ڕۆڵە... کێ ئەم درۆیەی بەناوی خوداوە پێ وتی؟**».

«**مامۆستای ئایینەکەمان... نەنێ**».

«**نەء... ڕۆڵە... ئەوەندەی من بزانم و لە مەلاکانم بیستووە... ئادەم و حەوا لە گوڵە گەنمەکەیان خواردووە!**».

«**بۆ چ لێی حەرام کردوون؟**».

«**حیکمەتی خۆیەتی**».

«**حیکمەت چییە... نەنێ؟**».

دڵی نەدەهات لێم بخوڕێتەوە، وەک هەندێ لە شەوانی پێشووتر داوام لێ بکا بنووم، چونکە بەیانی گەرەکە زوو لە خەو هەڵسێم... بەدەم چەورکردنی ناولەپمەوە زۆر بەنەرمونیانی میهرەبانترین نەنک لە دونیادا وەڵامی دامەوە:

«**خودا هەردووکیانی ئینتیحان کردووە... مامۆستا چۆن بزانێ تۆ باشی یان خەراپ گەر ئینتیحانت نەکا!**».

«**ڕاستە نەنێ... گەر ئەو گوناهە نەبووایە ئێستا ئێمە لە بەهەشت دەبووین و... هەرگیز نەدەمردین...**».





«**ڕۆڵە شیرینەکەم وایە... ژان و ژووری ژنانیش بەدەم منداڵبوونەوە هەر لە پای هەمان گوناحە... پیاوان کە ڕیش و سمێڵیان هەیە هەر هەمان سزایە...**».

«**نەدەبوو خودا دەری نەکردبان؟**».

«**نەء... ڕۆڵەکەم... نەء... چونکە دوای گوڵە گەنمەکە ئادەم و حەوا لەو بەهەشتە پاکەی خوا پیساییان کرد...**».

دەگریا و دەپاڕایەوە کە خودا لە گوناهەکانی ئەو و هەموو خانەوادە و موسڵمانان خۆش بێ... ئەو شەوە تا من خەوتم نەنکم بەسەر بەرماڵەکەوە دەگریا و دەبوورایەوە و وەک پیرە گورگێک دەیلووراند کە خودا بەگوناهەکانی ئادەم و حەوای لەگەڵ نەکات.

خودا هاوار... من بەتەمای چی بووم... دەمویست وەک فەرهاد عاشق بم و وەک موسا پێغەمبەری شوان مەزن و پیرۆزبم، کەچی وەک هەر قوتابییەکی تەمبەڵ ناولەپم ئاگر دەدەن... کە بەباوکەیان وت مامۆستا حەسیرمەیدانی پێ کردووم...

بێ باکانە وتی: «**موستەهەقە!**».

من بیرمە... چ زستانێکی ساردبوو کە بۆ دواجار مامۆستا عوسمان دوو پەنجەی دەستی ڕاستەمی شکاند، ڕۆژێک لەو ڕۆژە زۆر خۆشانەی من و شیرین بوو، ئەو چەند بەیانییەی کە من و ئەو یەکەم کەس بووین دەهاتینە پۆلەکە و بەدیار قرچەقرچی سووتانی داری قەڵاشکەری ناو زۆپاکە دادەنیشتین و من هەر باسی بزنە شێت و ئەو شوێنانەم بۆ دەکرد کە تازە دۆزیبومنەتەوە، جاروباریش بەمەکرەوە پەنجە شکاوەکانی خۆم پیشان دەدا تا پتر دڵی بکوڵێ و بۆم بگری، هەموو قسە جوانەکانی ناو حەکایەتەکانی نەنکم ئەزبەر بوو... زوو زوو سەرسامم دەکرد، پێی سەیر بوو کە ئەو هەموو حەکایەت و پەند و داستانەم ئەزبەرە... کەچی فاتیحا و سروودەکانی نیشتمان و خشتەی لێکدانم خولّق لێ نییە... دەموت:

«**شیرین خەم مەخۆ... و مەگری... ڕۆژێک دێ من و تۆ گەورە بین...**

**بەیەکەوە لەگەڵ بزنە شێت لەو شاخە بەرزە دەپەڕینەوە... دەڵێن ئەودیو شاری زۆر خۆش و ڕازاوەی لێیە... من ڕقی دونیام لە مەکتەبە...!»**.

لەشی گەرم داهاتووی بەگڕی زۆپاکە لە لەشم نزیک دەخستەوە و لە پەرچەمی بڕاوی ورد دەبوومەوە، وێنەی بزنە شێت و شیرین-م لێ تێکەڵ دەبوو، دەمویست لە ئامێزی بگرم و ماچی بکەم... وەک چۆن لە خۆشیانا تەوێڵی بزنەکە ماچ دەکەم، نێوان هەردوو برۆ پەیوەستەکانی... نەمدەوێرا... دەترسام لە ناکاو یەکێک لە هاوپۆلەکانم، مامۆستایەک، دەرگاوانەکەی بەڕێوەبەر، بەڕێوەبەر خۆی بێت و بمبینێ و قسەکەی دایکم بێتە دی و ئیدی ڕسوابم و ئابڕووم بچێ، ترسی مامۆستا عوسمان-م نەبوو، چونکە لە هەموو قوتابییەکانی پۆلی شەشم بیستبوو کە شەوان قەڕابەیەک دەخواتەوە و تا نیوەڕۆش بەری نادا... هەمیشە درەنگ دەهات، واش نەبووایە بوونی شیرین لە تەکما بەس بوو گوێ بەدارکارییەکی دیکەی مامۆستا عوسمان نەدەم... بەڵام ماچ... وەی هاوار... لەوەیاندا دەیکوشتم... کولْمەکانی دەبوون بەدوو پەنگر و دەسووتان، هاڵاوێک لە ئازای جەستەی بەرز دەبۆوە، هاڵاوێک کە هەستم دەکرد دەبێ بەتەمێکی تەنک و کەمەکێ ڕوخساری شیرین-ی لەبەرچاوانم لێڵ دەکرد، تاوتاوێک هەر پێنج پەنجەی ڕاستەمی دەخستە ناو دەمی چکۆڵەی خۆی و... هەناسەی گەرمی دەدا و دەیویست بەهاڵاوی ناو دەمی پەنجەکانم گەرم ببنەوە و سفتوسوێیان دامرکێتەوە و خوێنیان تێ بزێ، زمانی گەرمی بەر سەری پەنجەکانم دەکەوت و خەنی دەکردم، چەندین بەیانی زوو، بەر لە هاتنی هاوپۆلەکانم، هەر جارە و بەبیانوویەک من تکام لێ دەکرد کە زووتر بێ... دوای یەک هەفتە ئاوساوی دەست و پەنجەکانم کەمتر بۆوە، دوای ئەوەی نەنکم سێ جاران بردمی بۆ لای بەیتاڵ، هەندێک جار شیرین لەگەڵما دەی وت: «ئاخ». ئەو کاتەی برووسکەی ژانێک لە پەنجەکانمەوە دەگەیشتە کەللەم و دەیتاساندم، ئەو ئولفەت و خەم و نزیکبوونەوەی شیرین وەها سەرمەستی کردبووم کە حەز بەوە بکەم جارێک و دووی دیکە ناولەپم ئاگر بدەن و پەنجەکانم بئاوسێن...





تەنها و... تەنها بۆ ئەوەی شیرین دڵی پێم بسووتێ و بەهاڵاوی ناودەمی پەنجە مردووەکانم زیندوو بکاتەوە، ئەو بەیانییانەی کە هەردووکمان لە بەفر دەچەقین و پێڵاوەکانمان پڕ دەبوون لە ئاو... من خۆم لە بیر دەچۆوە و بەپەلە گۆرەوییە تەڕەکانم پێ دادەکەند و لەبەر زۆپاکە و بەقەراغ مێزێکەوە هەڵمدەخست تا زوو وشک بێتەوە، کە دەمزانی وەختی هاتنی قوتابییەکانە بەهەردوو دەست گۆرەوییەکانم لە گڕی هەڵایساوی کونی زۆپاکە نزیک دەخستەوە، هەمیشە بەر لە هاتنی ئێمە و زۆر زووتر (باجی لەعلی) زۆپاکەی گڕ دەدا، جاروبار هەردوو پێیە تەزیوەکانیم دەخستە ناو کۆشی خۆم تا سەرما لەسەری پەنجە تەزیوەکانی دەربکەم، هەندێک جاریش هەردوو دەستە سڕبووەکانیم دەخستە هەردوو بن هەنگڵی خۆم تا کەمەکێ گەرمتر ببنەوە، خامۆشی پۆل و گڕی زۆپاکە و پێڵووە کەوتووەکانی شیرین و حەکایەتەکانی بزنە شێت بۆ من لەیادچوونەوەی دونیایەک بوو پڕ لە دڵڕەقی باوکە و نقورچ و هەڕەشەکانی دایکە و ترسی مامۆستاکان و مەزاقی هاوپۆلەکانم، من چەندە دڵم بەو بەیانیانە خۆش بوو کە بەدزییەوە بەر لە هاتنی قاووقیژی قوتابییەکان من و شیرین گەورە و سەرداری پۆل بووین، لە یەکێک لەو بەیانیانەدا بوو کە مێزە خەراپەکەی شیرین-م گۆڕی، باشترین و تۆکمەترین مێزی پۆلەکەم بۆ دزی، لە یەکێک لەو بەیانیانەدا بوو کە لاسایی مامۆستا عوسمان-م کردەوە: سەگباب... بەخۆتەوە مێگەلەکەت چەند سەر مەڕ و بزنی تێدایە...؟ لاسایی مامۆستا یونس: تۆ وابزانە ئادەم-یت و شیرین حەوایە- و فریوت دەدا و دەڵێ سێوەکە بخۆ... خوداش فەرموویەتی مەیخۆ... بەڵام تۆ ئەوەندە نەگریس و هیچ و پووچی... ئەوەندە کەری کە دەیخۆی... شیرین قاقا پێدەکەنی و بەپشتدا دەکەوت و بەرملی سپی و سافی وەک بەرملی کۆترە باریکەیەک دەدرەوشایەوە، وام هەست دەکرد پێکەنینەکە لە قورگییەوە سەر دەکا و لەسەر هەردوو لێوە سووتاوەکانییەوە دەتەقین و سەرمەستیان دەکردم، هەر لەو بەیانیانەدا بوو کە جاروبار بەدەوری زۆپاکەدا سووکە سەمایەکی

شیرینانەی دەکرد و خۆی دەلەنگاند... لەگەڵ (با)دا دەخولایەوە و گێژی دەکردم... پێچپێک و دوو... و دە... کراسی کلۆشی پڕ دەبوو لە (با) تا سەر ئەژنۆ مەیلە و ڕەش و تاریکەکانی وەدەردەکەوتن، هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە کتومت لە بزنە شێت دەچێ، من سەیرم لە مامۆستای زانیاری دەهات کە دەی وت ئێمەی مرۆڤ دەگەڕێینەوە سەر ڕەگەزی مرۆڤی (نیاندرتال) کە سەر و کەللەی هەر لە مەیموون چووە، دەی وت مرۆڤی نیاندرتال هەر لەنێو ئەم شاخ و کێوانەدا ژیاوە، لەنێو ئەم ئەشکەوتانەدا، ڕاوی کەڵە کێوی کردووە و بۆقی خواردووە، من کە سەیری شیرین-م دەکرد... بەتەنها مەزەندەی ئەوەم دەکرد کە توخمی ئەم بگەڕێتەوە سەر بزنە کێوی، سەیرم لێ دەهات بەرملی ئەوەندە سپییە و سەر ئەژنۆکانی ئەوەندە ڕەشن.

من بەدیار گڕی زۆپاکەوە هەڵدەترووشکام و کز و زەبوونانە لە شیرین ڕادەمام کە وەک پەپوولە بەدەورمدا جوانترین سەمای دەکرد، بەهەردوو باڵی هەوای مردووی پۆلەکەی شپرزە دەکرد، لەسەر نووکی پێلاوەکانی دەخولایەوە و وەک کۆترە باریکە جارێک باڵی ڕاستە و جارێک باڵی چەپی لە زەوییەکە دەخشاند، گەردەلوولێکی زۆر شیرین لە تەم و جوانی و سۆزی بەدەوری مندا دەخولقاند، هەر خولانەوەیەک و بازنەیەکی بەچواردەوری مندا ڕەسم دەکرد و ئیدی من گێرۆدە و بەندەوار خێڵ دەبووم و لەو ڕادەمام، حەکایەتەکانی نەنکم پڕ بوون لە خۆشی و سەرسامی... بەڵام هیچیان وا سەرسام و سەرخۆشی نەدەکردم، خۆشی هەموو دونیام لەو بەیانیانەدا بوو، لەو ناوەش پەلکی زۆری ئەو گوڵە کێوییانە ڕژابوون کە من بۆ شیرین-م هێنابوو، هەرگیز نەمدەوێرا باس لەو خۆشی سەما و سوڕدانەی شیرین بکەم، شەوێکیان زۆرم لە خۆم کرد بەنەنکم وت و ئەو ڕازەم درکاند... بە چ ترس و خەمێکەوە وتی:

**«ڕۆڵە شیرینەکەم ئەم مەیلە شەیتانییە... ئەو هەوەسە گوناهە و... چیتر وا مەکە... با خودا هەر لە هەنووکەوە غەزەبت لێ نەگرێ»**.





هەر ئەو شەوە و... چەندین شەوی دیکە تێ دەکۆشا فێری نوێژم بکا تا چی زووە خۆم پاک بکەمەوە... بەڵام هەیهات من فاتیحاکەم هەر پێ ئەزبەر نەکرا... خۆشی دووەمم ئەوە بوو لە دوای بەرەڵابوون لە مەکتەب دەچوومەوە کن بزنە شێت... خودا هاوار چ خۆشییەک بوو هەر ڕۆژە و گوڵاوێک، کانییەکی تازە تەقیو و هێشتا شێلوو، گوڵێک، بەردێکی ڕەنگاوڕەنگ، هێلانەیەک، هێلکەیەکی تازە قرنجاو بەدەنووکی بێچووە مەلێک، ئەشکەوتێک، شانە هەنگێک، شانە مێروولەیەکم دەبینی، درەختێک ئاوساو و بارگران بەمیوەی وا کە لە هەموو ژیانما نەمدیبوو، هەڵفڕینی پۆلە مەلێک لەژێر دەوەنێکدا، شکانی لقێکی باریک لەژێر قورسایی جووتبوونی دوو کۆترە کێویدا، کەوتن بەسەر مێرگێک کە بەگوڵاڵە سوورە خوێناوی بووبێ، بێ ئاگا لە مێگەلەکەم جۆگەلەیەک دەستی دەگرتم و لەگەڵ خۆیدا دەیبردم، جار هەبوو وازم لە بزنە شێت دەهێنا و دەکەوتمە دوای (شوان هەڵخەڵەتێنە)... دەمزانی چ مەلێکی شەیتان و فریودەرە... تا پەنجەکانم بەر کلکی نەکەوتبا نەدەفڕی... خودا هاوار چەند جوان بوو ئەو فریوە... هەندێک جاریش کە دەمویست گوڵە کێوییەکی دەگمەن و جوان و بێ ناو بدۆزمەوە و دڵی شیرین-ی پێ خۆش بکەم، هەر دەگەڕام هیچ، لە ناکاو بزنە شێت بەدەم بای غارەوە دەیخستمە دوای خۆی... هەروەک بڵێی خەیاڵی منی خوێندبێتەوە تاوێک و دەیبردمە لای تووترکێک و دەمدی... دەمدی گوڵێک... گوڵێکی دەگمەن و گەشاوە لە ژێریدا خامۆشە، هەمیشە بزنە شێت دەبوو بەپێشەنگی من و کتوپڕ وەک عفریت و بزنەکانی ناو حەکایەتەکانی نەنکم دەیبردمە سەر گوڵە باخێک کە من نەمدەزانی چۆن چۆنی لەژێر ڕەوەزێکدا وا خامۆش و پەنهان ڕواوە و نوستووە... وەها بزر کە جگە لە شەیتان و بزنەکەی من کەس نەیدیوە، تەنها کەسێک کە ئەو هەموو ڕاز و درۆیانەم لە لا دەدرکاند شیرین بوو... ئەویش بەدەم سەماوە بێ سەرسەختی و گومان دەی وت: وایە... وایە... ئەو چەندە جوانتر سەمای دەکرد من پتر درۆ و ڕاستیم تێکەڵ دەکرد، خەون و خولیا، خەیاڵ و

زیندەخەو... شیرین بەدەورمدا سەمای دەکرد و کراسەکەی بازنەیەکی لە هەوایەکی خۆش ڕەسم دەکرد... تا شوێنێکم دەدی –خودایە... ئەستەغفیروڵڵا– گەر دایکم لەوێ بووایە بێ شک لەسەر ئەو چاوە زیت و بزانەم هەردوو پشتی دەستەکانمی داغ دەکرد... وام دەزانی دایکم، نەنێ... مامۆستا عوسمان لە پشت سەرمەوە وەستاون و لێم دەڕوانن... زەندەقم دەچوو... بەترس و شەرمەوە چاوەکانم نز دەکرد و کزۆڵە و شەرمن و ترسنۆک لە پێڵاوە قوڕاوییەکانی خۆم دەڕوانی... شیرین زوو زوو پێی دەوتم:

«**ئەوە چییە... داوەشێی... نایکەم... چاو هەڵبڕە!**».

سەرمابردەڵە و غەمگین دەمووت:

«**شیرین... سەما... بەسە... وەرە... دانیشە!**».

دانەدەنیشت... بێ ئاگا لە من، بێ ئاگا لە ترس و تۆقینی ناو ڕۆح و دڵە چکۆڵەکەم... خۆشی لێ دەهات کەوتۆتە سەر لەپی (با) و دەفڕێ... وەک پەروانە بەهەوادا بفڕێ لە گڕی زۆپاکە نزیک دەبۆوە... لەگەڵ جۆشی گەرمتری شیرین زۆپاکە نێڵەنێڵ دەسووتا و تەڵاشی دارەکانی دەتەقاند... بەدەم سەماوە لە منی کەللە کاس و وڕ نزیک دەبۆوە و دامێنی کراسەکەی لە ڕوومەتم دەدا... من لە خۆشیانا... لە ترسانا خەریک دەبوو بگریم... بگریم... گریانێک حەیای خۆم بەرم... لە حەژمەتانا بەرزەپێ هەڵدەستامەوە و پەنجەرەکانم بەڕووی هەوای زۆر سارد و تەزیوی شاخەکان دەکردەوە تا ئارەقەی سەر هەردوو ئەبرۆکانم سارد بکاتەوە.

شەوێکیان، خۆش خەیاڵ، زۆرم بۆ هات و بەنەنکم وت کە بەقەد فەرهادەکەی ناو حەکایەتەکەی منیش شیرین-م خۆش دەوێ... پێم وت کە منیش دەتوانم وەک فەرهادەکەی نەنکم کێوی بێستوون کون بکەم و کانیاوێک بتەقێنمەوە، بەگاڵتە و مەزاقێکەوە دەستی لە مەچەکی زۆر باریکم دەدا و پێدەکەنی:

«**ڕۆڵە شیرینەکەم با گەورەتر بیت... بەم قۆڵ و بازووانەوە قوڵنگ بەتۆ





بەرز ناکرێتەوە**».

هەموو جارێک غەمگینی دەکردم کە دەی وت:

«**واز لەم شیرین-ە بێنە... ئەم شیرین-ە شوو دەکا و تۆ هەر شوانی بەرخەلی... پەلە مەکە... شیرین-ی خۆت هەر پەیدا دەبێ!**».

هەمیشە هەڕەشەی لێ دەکردم کە ئەگەر مەڕێکی دیکەم هەڵدێرێ... یان گورگ زەفەری پێ ببات باوکە هەڵمدەواسێ... ترساندمی و سوێندی بەخودا و پێغەمبەران و چی ئەسحابە و ئەولیا هەیە خوارد کە ئیدی شەوانە حەکایەتم بۆ نەکات گەر من ئەوەندە خۆش خەیاڵ و کەم ماریفەت بم و خۆم بەلاس و مەم و سیامەند و فەرهاد بزانم... سوێندی دام کە شوانێکی عاقڵ بم و خۆم شێت نەکەم و نەکەومە دوای قشپلی بزنە شێت...

پێشبینی و ترسەکانی نەنکم هاتە دی، باوکە بۆ یەک هەفتە لەژێر زەمینەکە بەندی کردم، پوورە زولەیخام بەدزییەوە نانی بۆ دەهێنام، دوای ئەو ڕۆژە بوو کە بزنە شێت بردمییە ناو تەبارێک لە شلیک، ئەوەندەم خوارد دەت وت گورگێکی برسیم و دەمم بەخوێناوی ناو هەناوی مەڕێک سوور بووە... کە گەڕامەوە زانیم یەکێک لە مەڕەکانم ڕووەو خەرەندەکە هەڵدێراوە، خواردنی ئەو هەموو شلیکە و شەپازللە و لەقەقەکانی باوکم تووشی سک ئێشە و ڕشانەوەیان کردم... تا بەیانی دایکە و نەنکم بەدیارمەوە گریان... وایان زانی دەمرم... دواجار بەتکای بەڕێوەبەر و مامۆستای وەرزش منیان لەو ژێرزەمینە دەرهانی... لە دوای پاڕانەوەی هەر هەموو دەرودراوسێیەکان... عارم نەدەنا... بێ باک و ملهوڕ... هەمیشە دوای هەر لێدان و کوتانێک ڕاست دەبوومەوە و... بزنە شێت خۆت بگرە وا هاتم... باوکم پڕ بەدڵ دەی وت:

«**خودا بکەم خوێنی تۆ و بزنەکەت تێکەڵ بێ!**».

لەگەڵ بزنە شێت بەجووتە هەڵەتە و دەللی دەبووین، خۆمان دەدایە دەست توولە ڕێ و بزنە ڕێ و کوێرە ڕێگاکان، لەوەوە فێربووم کە تا بەڕاستە ڕێدا بڕۆین هیچ نابینین... هیچ نابیستین... لە بزنە شێتەوە فێربووم کە ئەو

ڕاستە ڕێیەی هەموو ئاوایی: بەژن و پیاوەوە، بەپیر و گەنجەوە، بەمەزن و مناڵەوە پیایدا دەڕۆن پڕە لە قەرسەقول و قشپل و تەپاڵە و تەپکەڕیخ... پڕە لە تف و بەڵغەم و بۆنی میزی مانگا و مەڕ و بزن و کەرەکان کە مرۆڤ کوێر دەکا... تەنها کە لە ڕاستە ڕێ لامان دەدا دەکەوتم بەسەر شارە مێروولەی وادا کە بەقەد شارۆچکەکەی خۆمان قەڵەباڵغ بوو، بازرقە و نەرمە غاری هەردووکمان و قریوەی من سەدەها مەلی کێوی هەڵدەفڕاند کە ئاسمانیان پڕ دەکرد لە ڕەنگ و جریوەی خۆش، هێلانەی وام دەدۆزییەوە کە پڕ بوون لە هێلکەی ڕەنگاوڕەنگ، ئەشکەوتی وا نسرم و سارد کە بەچلەی هاوین پێویستم بەکەپەنگ بێ، قرژاڵی وام دەبینی کە بەدوو سەر دەڕۆیی، ماسییە پانکەی وا کە هەر هەموو زەبر و ئازاری ڕاستەکانی مامۆستا و شەپازللەکانی باوکمی بیر دەبردمەوە، دەیەها جار شەوم بەسەر دادەهات و جریوە جریوی ئەستێران هەم شاگەشکەیان دەکردم و هەم ئاگاداریان دەکردمەوە کە لەوە درەنگتر بێ گورگ خوێنی من و بزنە شێتم تێکەڵ دەکا، شەوانە تا وەختی خەوتن بەدەم گوێگرتنەوە لە حەکایەتەکانی نەنکم دڕکم لەبن پێیەکانم دەردەهێنا...

ساڵ نەسووڕایەوە و مەڕێکی دیکەم بزر کرد: دزییان... گورگ خواردی... هەڵدێرا؟ نازانم.

لەسەر ئەو گوناهە گەورەیە هەفتەیەکی دیکەش زیندانی کرام، سەرباری شەق و تف و جوێن، دیسانەوە خزم و خوێش کەوتنە تکا و پاڕانەوە... لەگەڵ دەرودراوسێییەکان بەباوکمیان وت:

**«فەرهاد لەوە مناڵتر و نەفامترە بیکەی بەشوانی ئەو هەموو مەڕ و بزنە... لێی گەڕێ و با مەکتەبەکەی تەواو بکات...!».**

ڕێنماییان کرد کە ئیدی لە کەلی شەیتان بێتە خوارێ و یەک دوو سەگی هەوشاریش پەیدا بکا تا باشتر ڕۆحی مەڕ و بزنەکانی سەلامەت بێ، ئاخر باوکم ڕقی دونیای لە سەگ بوو... بەگڵاو و پیسی دەزانین، ئیدی لەو ڕۆژەوە من و بزنە شێت لێکدی دابڕاین، چ شوانێکی ترۆ بووم، چەندە





غەمگین و ڕیسوا و ڕەنج بەخەسار، هەر لەو ساتە وەختەوە بوو کە باوکە سەری ڕەزامەندی لەقاند و لە بری من (سیامەند)ی ئامۆزامی کرد بەشوان، لە ژێرزەمینە تاریکەکە نەخۆش و ڕەنگ زەرد منیان دەرهانی، هەتاوی حەوشە بەشەوارەی خستم... خودا هاوار... من چۆن تیاچووم کە زانیم باوکم سوێندی شەرەفی خوارد کە ئیدی تا ئەبەد نەهێڵێ من توخنی مەڕ و بزنەکانی بکەوم، لەوە خەمناکتر: سیامەندی ئامۆزام کە لە من هەراشتر بوو، ڕقی دونیای لە من و لە بزنەکەم بوو، ئیدی من بەوپەڕی دڵشکاوی و قەهرەوە بووم بەقوتابییەکی گوێڕایەڵ، ئیدی لە بزنە شێت و هەوای پاکی شاخان و گەمە و خۆشی هەموو دونیا بووم، دایکیشم بەبیانووی لانک ڕاژەندنەوە لە ماڵەوە بەندی دەکردم و دەی وت:

**«کوڕە شیرینەکەم... واز لەو خەیاڵە زۆر خراپانە بێنە و بەدەم لانک ڕاژەندنەوە دەرس و دەورەکەت بکە».**

بەرق و کینەی شەیتانێکی بێ دەستەڵاتەوە لانکم ڕادەژەند... ئاخر دایکە نەیدەزانی لە هەموو خەمەکانم گەورەتر ئەوەیە کە من چیدیکە ناتوانم گوڵی کێوی بۆ شیرین بێنمەوە و ئەویش قژی خۆی پێی برازێنێتەوە، بەیانیان سەمام بۆ بکا و جوانی پەڕەی گوڵەکانی لێ هەڵبوەرێ و من خەنی بکا، نەیدەزانی کە من ئیدی هیچ حەکایەتێکم پێ نامێنێ شیرین-ی پێ سەرسام بکەم، دوور لە بزنەکەم ئیدی دەم قرساو و کەڕولاڵ شیرین لێم ڕادەما و من یەک وشەم پێ نەدەوترا... کە ئەو بەدەوری ئاگری زۆپاکەدا سەمای دەکرد من سەرم دادەخست و دەگریام... ئاخر نەدەکرا چیتر درۆی زلی بۆ بکەم و بڵێم:

**«من ئەمرۆکە هێلکەیەکی حەوت ڕەنگم لە هێلانەیەکدا دۆزیوەتەوە!».**

ئەویش دڵپاکتر لە هەموو دونیا و سادەتر لە تەمەنی خۆی دەی وت:

**«دەستی لێ مەدە با پیس نەبێ... با مەلێکی حەوت ڕەنگ هەڵبێنێ».**

دەموت و... دەموت...

بێ باک لە درۆ و ڕاستییەکانم هەر گوێی شل دەکرد و... بەمەکرەوە

سەری با دەدا و... زەردە دەیگرت... بێ پرینگانەوە دەموت گوێم لە مەلێک بوو لە بری چریکە دەگریا...

بێ ترس دەموت شانە هەنگێکم دۆزیوەتەوە کە هەنگوینەکەی وەک قەترانی ڕەشە...

ئەم دەمی دادەپچڕی و من دەموت دارهەنارێکم دەستنیشان کردووە کە تامی هەنارەکانی شیرین و مزر و مێخۆشە...

دەی وت: **واو...**

تەواوێک دڵم لە مەکتەب تۆرا، دەمویست بیانوویەک بدۆزمەوە و ڕابکەم... وەک پاڵەوانێکی ئازای نەنکم خۆم لە شارێکی زۆر قەڵەباڵغدا ون بکەم... شیرین، نەرم و نیان، دڵی دەدامەوە و دەی وت:

«**چ نازانیت... فێرت دەکەم... با مامۆستا عوسمان و باوکت ئەوەندەی دیکە ڕقت لێ هەڵنەگرن!**».

شیرین نەیدەزانی دوای لێکدابڕانم لە بزنە خۆشەویست و هەرە تەنیاکەم من حەز بەمردن دەکەم... زەبوون و بێ دەستەڵات دەپاڕایەوە:

«**تۆ مەگری... من گوڵم ناوێ!**».

ئیدی تەواو... دڵم لەو بەیانیانەش تۆرا، هەر جارە و بەبیانوویەک خۆم دوا دەخست و درەنگتر لە جاران دەگەیشتم، شیرینم دەدی بەر لە من لەسەر مێزەکەی، مات و مەلوول، دانیشتووە و قژی پەخشی سەر مێزەکەی داگیر کردووە و قەف قەف بەهەموو لایەکدا پەرش و بڵاوە، بەترسی کچۆڵەیەکەوە و لە بەیانییەکی وا خامۆشدا لەگەڵ تەپەی پێڵاوەکانم سەری بەرز دەکردەوە، چەندە تەریق دەبوومەوە کە وەک شیرین-ێکی دۆڕاو و تۆراو لە منی دەڕوانی... چاوانی پڕ لە نزا و سۆز و گلەیی... جارێکیان بەقورگێکی پڕ لە گریانەوە وتی:

«**من دەمزانی ئەمساڵ لە هەموو وانەکانت دەکەویت و...**».

کە زانی ڕەنگم هەڵبزڕکا تەواوی نەکرد، زانیم دەیویست بڵێ من دەمێنمەوە و ئەو بەتەنیا پۆلێکی دیکە دەبڕێ...





قسەکەی گۆڕی و بەدوو چاوی پڕ لە گلەیی و حەسرەتەوە وتی:

«**تۆ... تۆ... بزنەکەی خۆتت لە من خۆشتر دەوێ**».

ویستم وەک عاشقە ڕووتەی ناو حەکایەتەکانی نەنکم بکەومە سەر ئەژنۆ و شەیدایانە پێی بڵێم تۆ هەر ئەو تاقە شیرین-ەی کە مامۆستا عوسمان لێم دەدا... تۆ... بەتەنها تۆ بۆ من دەگری... بەس چی بکەم...؟ لەوە گێلتر بووم ڕستەیەکی جوان و عاشقانە لە دەمم بێتە دەرێ، من تەنها ئەوسا دەمتوانی بەقسە و ڕاز و حەکایەت و سیحری نهێنییەکانی ناو شاخ و داخان شیرین سەرسام بکەم کە هێشتا من و بزنە شێتەکەم لێک دانەبڕابووین، ئەم نەیدەزانی من زمانم لە گۆ کەوتووە و قسەشم بیرچۆتەوە، هەر هەمووی گوناهی نەنکم بوو... چەندە دڵتەنگی دەکردم کە دەی وت:

«**ڕۆڵە شیرینەکەم... تۆ زۆر لەوە چکۆڵەتری خۆت بەفەرهاد بزانیت!**».

بەپەنجە گرژ و وشکەکانی، چڵ و چێو ئاساکانی، بۆی دەژماردم کە من دەیەها ساڵ و سەدەها ڕۆژم لەبەردەم ماوە تا بزانم عاشق چۆن لەسەر ئەژنۆ دەکەوێ و خۆڵ دەخوا و بەرپێی مەعشووقەکەی بەفرمێسکان تەڕ دەکا و لێی دەپاڕێتەوە تا چیتر گومانی لێ نەکات...

ئاخ... خودا هاوارە... من چ شوانێکی دۆڕاو و چ عاشقێکی سەرە میکوتە و گرگن بووم... لە دڵەوە دەگریام کە من هەموو شتێکم دۆڕاند... نە بوومە شوانێکی چاک، نە عاشقێکی سەرکەوتوو، نە پێغەمبەر...

باوکم پڕ بەحەوشەکە هاواری دەکرد... کەو و کۆترەکانی خۆی دەترساند و دەی وت:

«**سمێڵم بتاشن ئەگەر مەکتەبەکەشی تەواو کرد**».

دڵڕەقانە بەدایکمی دەوت:

«*خۆزیا لە بارت دەچوو... ئەوە کوڕە تۆ هەتە یان ترێ کەرەکەمە...!*».

شیرین لەوە ساواتر بوو بزانێ من چ قوتابییەکی مایەپووچم کە ڕقی دونیام لەو سرووده هیچانەیە کە بەشەق پێمی ئەزبەر دەکەن... چ شوانێکی ڕسوا... چ عاشقێکی لاڵ کە هەرگیز وەک عاشقی ناو حەکایەتەکان

قسەزان و زمان شیرین و دڵ لەسەر دەست و بوێرنیم... شیرین لە من جوانتر و ئازاتر بوو؛ هەرگیز پێی نەدەوتم:

**«بۆچی درەنگ دێی؟ بۆ خۆت دەدزیتەوە؟»** .

عاشقانە بەر لە من دەهات و دڵی دەدامەوە و دەی وت:

**«ڕۆژێک دێ تۆش گەورە دەبیت و دەبی بەخاوەنی هەزار بزن»** .

ئەم نەیدەزانی من بزنە شێت بەهەموو بزنەکانی دونیا ناگۆڕمەوە، دڵڕەقانە پێم دەوت:

**«تۆ هیچ نازانی... کێ دەڵێ کە من گەورە بووم بزنێکی وا جوان و بزێوم دەبێ؟»** .

من لە هەموو خۆشی دونیا و گەنجینەی نهێنییەکان بێ بەری بووم، من لەوە زۆر دەترسام تا من گەورە دەبم شیرین-یش وەک کچە غەمگینەکانی ناو حەکایەتەکان کۆچ بکا، نەخۆش بکەوێ و بمرێ، بەزۆر لە کوڕە شایەک یان گەدایەک مارە بکرێ و منیش وەک هەر عاشقێکی چکۆڵە و نامراد کۆستم بکەوێ... من لاڵتر بووم لەوەی ئەو هەموو ڕاز و نیازانە بدرکێنم... شەوێکیان بەدەم هەنسکەوە بەنەنکم وت:

**«نەنێ هەتا کەی من لەو ژێرزەمینە حەپس دەکەن؟ مردم ئەوەندەی لانکیش ڕاژەنم... دایکە هەر ساڵە و بۆ گیانی من منداڵێکی دەبێ...؟»** .

هەڕەشەی ئەوەی لێ کردم کە ئەو قسەیە گوناهە و خودا منداڵ دەبەخشێ و هەر خۆیشی دەیباتەوە... بەداخێکەوە پێم وت:

**«من خەریکە ڕقم لە هەمووتان دەبێتەوە... نەنێ!»** .

بەسەرسامییەوە پرسی:

**«لە منیش؟ لە دایکە و باوکەش...؟ ئەی خوشک و براکانی خۆت... لەوانیش؟»** .

وەک ئەوەی لە شەیتانێکی چکۆڵە و نەگریس ڕابمێنێ چاوەڕێی وەڵام بوو... من شەرمەندە و زەبوون سەرم داخست و چاوەپڕ لە قەهر و کینەکانی خۆم لێ دەشاردەوە... تۆزێک ڕاما و وتی:





**«لەسەر ئەو ڕقەت لە دایکە و باوکە خودا دەتخاتە ناوەڕاستی دۆزەخەوە، لەو شوێنەی شەیتان بەستوونێکی ئاگرەوە بەستراوەتەوە...»** .

کە چارم نەما ئیدی خۆم دەدایە دەست خەیاڵ، هەر بەخەیاڵ خۆم دەدی لە تەک بزنە شێت ڕادەکەم و لە ڕاستەڕێ لادەدەم و دەکەومە ناو باخی گێلاس و ڕەزی قەدپاڵ، هەر بەخەیاڵ خۆم لەسەر دوند و ڕەوەز و ترۆپکی گاشەبەردە زەلامەکان دەدۆزییەوە، خۆم لەنێو بۆنی گرانی ژوورە تاریکەکان دەردێنا و دەستم لە لانک بەردەدا و لە ناکاو خۆم دەدایە بەرتاڤگەی بەخوڕی قەدپاڵەکان و ئارەقەی لەشم بەمەلەیەک لەناو کانیاوەکاندا بەجێ دەهێشت، تەنها زریکەی کتوپڕ و بێ ئامانی کۆرپە ساواکەی ناو لانکەکە خەیاڵی منی پەرت دەکرد و دەیهێنامەوە ناو ژوورە بان تەپیوەکان، ئەوەندە نزم و تەپیو کە وام هەست دەکرد بەسەر مندا دەڕمێ و... ڕۆژێک دێ لەژێر داروپەردووی بەسەر یەکدارماوی بمرم و دەمم پڕ بێ لە خۆڵ و تۆز... ئیدی بەچ قەهر و خەم و خۆ خواردنێکەوە... بە چ ڕقێکەوە لانکەکەم ڕادەژەند... ژوور پڕ دەبوو لە زریکە... زریکەیەک بمترسێنێ لەوەی کە بنمیچەکە لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێ... ناچار ڕقەکەم لە دڵما دەکوشت و نەرمتر لانکەکەم ڕادەژەند تا جارێکی تر کۆرپەکە خەو بیباتەوە و منیش بکەومەوە دوای بزنەکەم و هەڵفڕاندنی مەلە کێوییەکان، خۆم دەدایەوە دەست کوێرە ڕێگاکان و جۆگەلە ڕاکردووەکان کە ڕێزی هیچ کۆسپ و داروبەردێکیان نەدەگرت، بێ مەبەست وەک هەر جۆگەلەیەکی سەرمەست لەژێر هەتاو و تریفەدا بەدەم قەڵبەزە و کەمچڕینەوە لە گێژەن و شەپۆڵدان نەدەکەوت و دەڕژایەوە ناو شەتاوێک، هەر بەخەیاڵ بزنەکەمم دەدی دەلەوەڕا و منیش چەپکێک گوڵم دەچنییەوە بەلاسکە گیایەک چەپکێکم لێ دەبەست و دەمهێنایەوە ژوورە تەنیاکەم، تەنها شتێک کە خەوی لێ دەخستم و خەیاڵی خۆش دەکردم حەکایەتەکانی نەنکم بوو، لاوانەوە و دڵدانەوەی ئەو... بۆ قایلکردنی دڵی من دەی وت:

**«جەرگەکەم... مەکتەبەکەت تەواو بکە... خەیاڵی بزنە شێت و ئەو دەشت**

**و کێوە دابنێ... زوو گەورەبە و نەنکە پیرەکەی خۆت بەخێو بکە...»** .

سەرم دەخستە سەر ڕانی و خۆم شل دەکرد سەروپرچی بەخورشتم بخورێنێ و پێم دەوت و دەمپرسی:

**«نەنێ... من گەورەش بم هەر دەمەوە بەشوان... ئەرێ نەنێ گیان من زۆرتر دەژیم یان بزنە شێت؟»** .

بەترسی پیرەژنێکەوە زمانی تەتەڵەی دەکرد و پێی دەوتم:

**«بەڵاگێڕت بم خودا گەورەیە و عومری بیست بزنی داوە بەتۆ...»** .

چەندە غەمگین بووم کە زانیم بزنەکەم مەرگی پێش مەرگی من دەکەوێ، دەمزانی ڕۆژێک لە ڕۆژان باوکم گەر لە ڕقی منیش نەبێ... بەبیانووی قوربانی سەری دەبڕێ، دەمەو ئێواران بێ ئۆقرە لە حەوشە و لەناو کۆڵان چاوەڕێی گەڕانەوەی مێگەلەکەم دەکرد و لە دوورەوە باوەشم بۆ بزنە شێت دەکردەوە، تێر تێر یەکدیمان بۆن دەکرد... چەندە سەرکز و مەلوول دەهاتە بەر چاوم، هەرگیز وەک جاران کەللەبەرز و پڕ هەوا و فیز و شکۆ نەمدەدی، کە شەو دادەهات بەدزی باوکم و دایکم و نەنکم و هەر هەموو خوشک و برا و پوورەکانمەوە دەستم دەدایە فانووسێک و دەچوومە تەویلەکە، مەڕ و بزنەکان بەدەم پرمە پرمەوە ڕادەپەڕین و ڕۆشنایی چراکە هەر هەموویانی شپرزە دەکرد، ورد ورد دەمپشکنی، چڵکن و ڕیخن بوو، هەر ڕۆژە و جێ برینێکم لە لەشی دەدۆزییەوە، چاوەکانی کوژاوە و بێ ڕۆشنایی بوون، بەرملی تا دەهات گەڕتر دەبوو... هێدی هێدی مووەکانی دەمردن و هەڵدەوەرین، تیسکەکانی وەک جاران نەدەبریسکایەوە، هەمیشە پاشەڵی پیس و میزاوی بوو، بەسەرچوو ئەو ڕۆژگارەی من پاک و خاوێن لەناو جۆگەکاندا گەندوگووم لێ دادەماڵی، لە تۆز و خۆڵی ڕێگاکان پاکم دەکردەوە کە تا هەردوو کونی چاوانی داپۆشیبوو، بۆنم دەکرد... نە بۆنی گوڵە کێوییەکانی لێ دەهات و نە شێی جێماوی ئاوی کانیاوەکان لەسەر پشتی چڵکنی، کزۆڵە و مردەڵە لە منی دەڕوانی، بەخەمێکەوە و زۆر بێ هێزانە دەیقاڕاند، هەردوو گوێی تەواو بریندار بوون، کە زۆر لێی ورد بوومەوە هەموو گیانی





گەنە بوو، دووسێ کرمم لەناو کونی گوێی چەپی دۆزییەوە شەوێکی تر کە بەدزییەوە هێنامە دەرێ و بەیادی جاران دامە بەر تریفەی مانگ دیم زۆر گران دەڕوا و دەشەلی... هۆن هۆن گریام، زانیم ئەو سەگی سەگبابە بەزەبری گۆچان قاچی ڕاستەی شکاندووە و کەسیش باکی نییە بۆی بگرێتەوە، چیتر بۆنی ئەشکەوتە نسرمەکانی لێ نەدەهات، دەستم لە هەردوو ڕانی دەدا و هەستم پێ دەکرد وەک جاران گۆشت و ماسوولکەکانی توند و گرژ و تورت نین، نا هەرگیز ئەم بزنە؛ بزنە شێتەکەی من نییە، ئەو شەوە وەک من غەمگین بوو... بەرۆحێکی ئادەمییانەوە لە تریفەی زیوینی مانگی دەڕوانی و دەگریا، هەردووکمان، برا بەش، بۆ شکۆی دۆڕاومان فرمێسکمان بۆ ڕاگیر نەدەکرا... نا... تازە مەحاڵ بوو بەو چوارپەلە زۆر باریکەوە، بەقاچێکی شکاوەوە بەسەر شاخ و داخەکاندا هەڵبگەڕێ و وەک جارانیش کەللەی پڕ بکا لە هەوای شاخان، بەفیزێکەوە لەسەر کەرتە شاخێک بوەستێ و لە تین و تاوی خۆر بڕوانێ، دەستم لە مل کرد بەبەرچاوی ئەو هەموو مەڕ و بزنە ملکەچ و خەواڵووەوە دامە پرمەی گریان، زانیم کە هەردووکمان زیندانین، لێکدی دابڕاوین، بەبێ یەکدی هەڵناکەین، زانیم... هەر زوو زانیم و لە ڕۆژی یەکەمەوە دیاربوو سیامەندی ئامۆزام ویستی فیز و شکۆی پێ دابنێ، چاوی بشکێنێ و زەندەقی ببات، زانیم بەزەبری گۆچانە گرنج گرنجەکەی کەللەی کاس دەکا و وەک هەر هەموو مەڕ و بزنەکانی سەر کز و زەلیلی دەکا، من جێ برین و قنجانی گۆچانەکەم لەسەر لاشەی لەڕی بزنە شێت دەناسییەوە، من دەمزانی سیامەند چ کافرێکە و لەسەر خواردنی هەر چڵەگیایەکی حەرام چۆن تەوێڵی ئاگر دەدا شاخی دەشکێنێ، لەسەر هەر لە ڕێ لادانێک چۆن لمووزی پڕ دەکا لە خوێن، دڵڕەقترین شوانی ئاوایی... نەنکیشم بڕوای وابوو کە سیامەند مەحاڵە بەعاشق بێ، مەحاڵە ببێ بەمەسینە هەڵگری پێغەمبەرێک، لە نەنکم پاڕامەوە کە هەتا زووە قاچی بۆ بگرینەوە، هەر زوو کەوتە دروستکردنی ڕۆن و مەڵهەمێک لە ڕۆحی گیاوگوڵە

کوتراوەکان، شەوانە درەنگ بەدزییەوە من و نەنێ بەیەکەوە دەکەوتینە دوای ڕۆشنایی فانووسێک و لە تەویلەکەدا برینەکانی بزنە شێتمان تیمار دەکرد و نەنێ بەشێنەیی و وەستایانە، بەدەست و پەنجەیەکی لەرزۆکەوە، کەس نەزانم قاچی بۆ دەبەستەوە، من دەمزانی یەکێکمان یان هەردووکمان بەو داخەوە دەمرین، نیوەی ساڵ وەرزش و مۆسیقا و ڕەسمی لێ دەربچێ لە هەر هەموو وانەکانی دیکە کەوتم، تەواو... چیدیکە خولقی موتالام نەما، لەسەر ئەوەش شەق و زللە و پێلەقەیەکی زۆرم خوارد، حەسیرمەیدانێکی وابوو کە گەلاوگەڵ دەڕۆیشتم بەڕێوە، دایکەش لە ترسی باوکە و لە قەهری ئەوەی ئەوەندە بێ گوێم هەموو ئازای جەستەمی بەنقورچ شین و مۆر کردبۆوە، ئەو دایکە ترسنۆکەی من هەم نقورچی لێ دەگرتم و هەم بۆم دەگریا، پەڕۆی گەرم دەکرد و دەیخستە سەر ئەو شوێنانەی خوێنی تێ زابوو، من لە ژێرەوە دڵم بەوە خۆش بوو کە من و بزنەکەم سەرکێش و بریندارین و هەرگیز ملکەچ و گوێڕایەڵ نابین، بەهەزار تکا و پاڕانەوەی نەنکم و هەڕەشە و گوڕەشەی دایکم دوو پاروو نانم دەخوارد، وەک بزنەکەم لەڕولاواز و بێ کەیف بووم، نەنکم بەسەرمدا دەنووشتایەوە و دەگریا:

«**ڕۆڵە فەرهاد... هەردوو سپێنەی چاوەکانت زەرد بوون... تۆزێک گۆشت و چەوری بخۆ**».

کە شەو دادەهات، بەدەم هەناسەی گران و کۆکەکۆکەوە، حەکایەتی شیرین و فەرهاد-ی بۆ من دووبارە و دە بارە دەکردەوە... منیش بەدەم نووزەی نەخۆشێکەوە دەموت:

«**نەنەگیان... با مەکتەبیش تەواو بکەم... من کە شوان نەبم چۆن دەبمە ئەو عاشقەی تۆ لە حەکایەتەکان باسی دەکەی؟ چۆن دەبمە پێغەمبەر؟**».

بەدەم قول ئەعوزو... ئەستەغفیروڵلاوە ترسێکی گەورەی لێ دەنیشت و ئاگاداری دەکردمەوە کە ئەوەیان کوفرە و گوناهم دەگاتێ و دەی وت:

«**ڕۆڵە شیرینەکەم... موحەممەدەل موستەفا دوا شوان و دوا پێغەمبەر بوو... ئیدی دوای ئەو فەخری عالەمە تەواو... پەلەت نەبێ گەورە دەبیت و**





**شیرین-ی خۆت هەر دەدۆزیتەوە!**».

کە نائومێد دەبووم لەوەی بەعاشق بم... بە چ خەم و عەزرەتێکەوە دەمخواست هەتا زووە گەورەبم و باڵا بکەم، دەست و بازووم وەک فەرهاد-ی سەنگتاش ئەستووربێ، ڕیش و سمێڵم بێ، بەڕووی باوکمدا هەڵشاخێم و بەبەرچاوی ئەوەوە هەموو کتێب و دەفتەرەکان بدڕێنم و پێی بڵێم:

«**من خولقی ئەو مەکتەبە سارد و سڕەم نییە. دەگەڕێمەوە ناو ئەو شاخ و کێوانە**».

چ ناخۆش بوو کە مامۆستاکان دەیان وت ئەوەی تا لیدانی زەنگەکە پەنجەی شایەتمانەی لە سەردەمی لانەبات نمرەیەکی بۆ زیاد دەکەم... ئەوان وایان دەوت و من خەیاڵم لەگەڵ کوکوختییەک دەفڕی کە لەسەر لقی درەختەکەی بەر پەنجەرەکە هەڵدەفڕی و دەیبردمەوە ناو شینایی ئاسمان، چەندین جار ئەو وەختەی شوان بووم برسیەتی و تاریکی شەو نەبووایە کە هێدی هێدی شینایی ئاسمانی لە چاوانما دەکوشت وەئاگا نەدەهاتم... نەدەچوومەوە... تا دەهات کەڕولاڵتر دەبووم، وەک بزنەکەم بەستەزمان و بێ ورتە بووم، دڵم بەوە خۆش بوو کە ڕقم لە مەکتەبە و لە هەموو وانەکان کەوتووم، دەمویست پێیان بڵێم گەر من بەکەڵکی شوانی نەیەم، ئەوە سەد جاران بەکەڵکی مەکتەب نایەم، لەهەر شوێنێک بوومایە، چ لە ماڵ و چ لە مەکتەب: من هەر دارکاری دەکرام، لە هەموو شتێک بێزار بووم، ئیدی بڕیارم دا کە بمرم؛ بەتایبەت کە زانیم مەرگی بزنەکەم پێش مەرگی من دەکەوێ و من بیست ئەوەندەی ئەو دەژیم، لەو زیندانەی خۆمدا بەدەم لانک ڕاژەندنەوە خۆم بەدیوارەکەوە دەنووساند و وەک بزنە گەڕەکەم کە خۆی لە داروبەرد دەخشاند تا خورشتی پێستی بمڕێنێ؛ منیش لاشان و شەپیلک و قۆڵم لە دیوار دەخشاند تا لە چەند جێوە برینم تێ کەوت... دەگریام... هەستم دەکرد هەموو دونیا دوژمنی من و بزنەکەمە و ئێمەش دوو بەستەزمانترین حەیوانین لەسەر ئەم ئەرزە، زۆربەی کات لەژێرزەمینە تاریکەکەدا خۆم حەشار دەدا، بێ بەری لە گەمە و خۆشی و زرمەزلێی

هاوڕێیانم، بەرقی شەیتانێکی کوێرەوە دڵم لە هەموو دونیا تۆرابوو، بەتەنها یەک کلاوڕۆژنە لە شێوەی پەنجەرەیەکی شووشەبەند و تەلبەندکراو تروسکاییەکی شەرمن و مردووی لەگەڵ هات و هاواری منالانی کۆلانێ بۆ دەهێنام، شەرەشەقی بێ بڕانەوەیان لە کاسەی سەرما دەزرنگایەوە، لە شووشە تەلخ و ئەستوورەکەیان دەدا و دەنگیان دەدام کە تا کەی لەو ژێرزەمینە خۆم بەند کردووە و ناچمە دەرێ، ئەوان نەیان دەزانی کە من لەو ژێرزەمینەدا زیندانی کراوم لە گوناهی ئەوەی کە لە زۆربەی وانەکانم کەوتووم، نە بەکەڵکی شوانکارەیی هاتم و نە بەکەڵکی مەکتەب، چ بێ خەون و خەیاڵ و تەنیا مامەوە، بەمن چی گەمەی بردنەوە و دۆڕانی منداڵانی کۆڵان کە من خۆم شوانێکی مایەپووچ و قوتابییەکی دۆڕاو بم، ئەوان منیان نەدەدی کە بەدەم ڕاژەندنی لانکی ئەو هەموو خوشک و برایانەم شان و شەپیلکم بەربۆتەوە، چ سزایەکی ئەبەدی بوو کە ساڵ نەدەسووڕایەوە و واقەی کۆرپەیەکی تازە کە لە دامێنی دایکمەوە دەکەوتە ناو چنگی مامان منی لە خەو ڕادەچڵەکاند... ئەوان منیان نەدەدی کە هۆن هۆن دەگریام، هەمیشە لە قاووقریشکەی ئەو بیژمۆتانە بوو کە هەر دەت وت سینەی من گۆڕەپانی گەمەکانی ئەوانە، هەموو دونیا بێ ئاگابوو لە دەردی من، دڵم لای ئەو تۆپە بوو کە ئەوان بەرشەقیان دەدا، وام هەست دەکرد ئەو تۆپە دڵی منە و هەرچی کوڕی گەڕەک هەیە شەق شەقێنی پێ دەکا، من غەمگینترین منداڵی کۆڵانە خۆڵاوییەکانی ئەم دونیایە بووم، لە مەکتەب ساقیت و ڕسوا، دوور لە سەرچڵییەکانی بزنە شێت و سەر خەرەندی پڕ لە ئەفسوون، دوور لە خەنینی شیرین، هەر شەوێک و برینێکی تازەم لە لەشی بزنەکەم دەدۆزییەوە، گەڕی لە هەردوو گوێیەکانییەوە پەڕیبۆوە هەردوو لا ملی، برینی بێ قەتماغە تا سەر دەمار و گۆشتە سوورباوەکەی ڕۆیشتبوو، تیسکی هەڵوەریبوو، دەت وت بەنووکە چەقۆیەک هەڵیانکۆڵیوە، خۆم پێ نەگیرا و بەیانییەکی تاریک و ڕوون کە سیامەند هات، بەدەم پڕمەپڕمەوە، مێگەل لە تەویلەکە دەربێنێ و ڕای دا؛





دەت وت گورنەتەڵەم لە بەردەم قەلافەتی ئەودا... بەقەهری شوانێکی دۆڕاوەوە کە ڕانەمەڕەکەی گورگ لێی دابێ... پێم وت:

«**سیامەند... گوناهت دەگاتێ... بۆ وا لە بزنە شێت دەکەی؟**».

گورگانە پێکەنی و هەردوو کەڵبەی زەردی لە ژێر لچییەوە دەرکەوتن... لەو بەرەبەیانییەدا هەر لە فریشتە و شەیتان دەچووین... بەفیزی شوانێکەوە کە هەر هەموو خێڵەکەمان شانازی پێوە بکەن پێی وتم:

«**جوان قسە بکە... سیامەند کێیە؟ بڵێ: کاکە سیامەند... خۆ من لە تۆ نەبوویە... پاشان ئەوەتا خۆت دەڵێی -بزنە شێت- گەر تۆ شوانێکی شێتوێت بوویت و شێتی بزنی شێت و تەگەی هاریت... ئەوە من وەک شوانێکی عاقڵ کە دەبێ نانی خۆم حەلاڵ بکەم... ناچارم چی بزنی شێت هەیە عاقڵی بکەم هەتا گەر بەکوشتنیشی بێ**».

زەحمەت بوو بۆ منێکی کەللەپووت لەو حەلاڵ و حەرامە تێ بگەم، ئیدی هەر ئەوەندەی وت و ڕووی لە من وەرگێڕا و بەبەرچاومەوە کە بزنە شێت تەمای بوو لە من نزیک ببێتەوە، ئەم دڵڕەقانە گۆچانێکی خێواندێ و ڕەواندییەوە، ڕای دایەوە ناو مێگەل و پشتی لە من کرد، وەک کوڕی خاوەن مەڕ و بزنەکانیش هیچ ڕێزێکی بۆ دانەنام... تەواو... من زانیم تازە مەحاڵە کەس گوێم لێ بگرێ...

وەها سووک و دڵشکاو و سەرکز ببووم کە وام لێ بێ مایەی پێ ڕابواردنی مامۆستا عوسمان و هاوپۆلەکانم و لاقرتێی سیامەند و سەرزەنشتەکانی دایکم و گۆچانەکانی باوکم بم، هەمیشە وەختی پشووی نێوان وانەکان لەوە غەمگینتر و دڵشکاوتر بووم بەدەم بای غارەوە ڕاوەدووی شیرین بنێم، بەزۆر پەلی دەگرتم و نەدەجوولام، دەت وت بەتەختەکەوە نووساوم، بەدەم خەیاڵەوە دەفتەرەکانم پڕ کردبوون لە وێنەی بزنە شێت: ئەو کاتەی لە ڕاستەڕێ لادەدا، چڵەگیایەکی زۆر سەوز و حەرام دەخوا، دەچێتە سەر دوندێک، لە کانیاوێکدا ئاو دەخواتەوە، زەنگوڵەیەکی لە ملە و بۆتە پێشەنگی هەر هەموو مەڕ و بزنەکانی دیکە و بگرە

سیامەند-یش لە دوایەوە دەڕوات، وێنەیەکی زۆر ناشیرینی خۆم کە کەیفخۆش دیارم و لە ئاوێکدا بزنەکەم دەشۆم، لە وێنەیەکی دیکەدا بێ ئاگا لە خۆم بزنەکەم هەڵدێراوە و بەسەر درەختێکی لاپاڵی خەرەندەکەدا گیرساوەتەوە، هەر ئەو ترس و خۆشەویستییە زۆرە بوو وای لێ کردم بەهەر بیانوویەک بێ زەلیل و ملکەچانە، لە سەفەرێکی باوکم بۆ ئەودیو سنوور، تکا لە سیامەند بکەم بۆ یەک دوو جار لەگەڵ خۆی بمبا... وام دەرخست کە بەهارە و هەندێ گژوگیا بۆ دایکم و نەنێ کۆدەکەمەوە، وەها پاڕامەوە کە بێ ئاگا لە خۆم دڵم پڕ بوو... دامە پڕمەی گریان، کە منی بینی دەگریم سینەی پڕ لە هەوا و فیز، وەک شوانێکی بێ باک و سەرکەوتوو کە هەرگیز وەک من خۆی سووک و ڕسوا ناکا... پێی وتم:

«**خەراپ ناکەی... دەتبەم... بزنە شێتەکەشت ببینە چۆن کردوومە بەبزن مشک... بمبینە و فێربە... بزانە شوانی چۆنە ڕۆڵە نەبا مەکتەبەکەت پێ تەواو نەکرێ...!**».

لەوە بێ دەستەڵاتتر بووم لێی هەڵگەڕێمەوە، لەوە ڕسوا و تەنیاتر بووم... دەنا هەقی وابوو شەقێک لە بن گونی هەڵبدەم و قۆڕی بکەم... نەدەکرا... قسە ڕەقەکانی لە دڵی دەدام... بەس من خۆم بەوە سەرمەست کرد کە ئیدی بۆ چەند جارێکی دیکە بەیەکەوە لەگەڵ بزنەکەم، لەنێو ئەو شاخ و داخانە ڕاوەدووی یەکدی دەنێین.

خودا هاوار چ ڕێکەوتێکی ناشیرین و... چ مردنێک بوو... پاش نیوەڕۆیەک کە لە مەکتەب هاتمەوە، بەپەلە و بەپێوە دوو پاروو گلاند، بەدزییەوە قوچاندم... دەمزانی سیامەند لە کام مێرگ مێگەلەکەی مۆڵ داوە، وەک بزنە شێت بەسەر دڕک و داڵدا... بەسەر بەرد و تەلان و کەرتە شاخدا غارم دەدا؛ شادومان بەوەی تۆزێکی دیکە و دوای ئەو هەموو ڕۆژانەی لێک دابڕان من و ئەو حەیوانە زۆر جوانە بەیەکدی شاد دەبینەوە، گژوگیا دەچنمەوە و بەکوێرایی چاوی سیامەند دەسک دەسک دەیئاخنمە دەمییەوە، بەئاوی -کانییە دەرمان- برینەکانی بۆ پاک دەکەمەوە،





دیسانەوە دەکەومەوە دوای بەو ئومێدەی لەناو ئەو شاخ و داخ و دارودەوەنەدا وێڵم بکات و هەرگیزاو هەرگیز نەکەومەوە سەر ڕێی ماڵەوە و چیدیکە باوکم نەبینمەوە، وێڵ بم و نەگەڕێمەوە مەکتەب... و مامۆستا عوسمان نەبینمەوە...

هێشتا زۆرم مابوو بگەمە لای مێگەلەکە، کەچی لە دوورەوە وەک شوانێکی لێزان هەر بەبۆن زانیم لە کام مێرگدا سیامەند مێگەلەکە دەلەوەڕێنێ، سەرەتای بەهاربوو، قاچ و قولم لە گژوگیای تەڕ و گەشاوەی ژێر بارانی شەوی پێشووتر وەردا، ناو هەردوو لەپی گەرمم پێ تەڕ دەکرد، دەموچاوم لە لق و پۆپی ژێرکەوتووی گەڵا و چرۆکان هەڵدەسوویی و شاگەشکە دەبووم، سەرم هەڵدەبڕی و شینایی ئاسمان دەڕژایە هەردوو چاومەوە و هەتاو دەیشۆریم، دەت وت مەلی تازە ئازادکراوی نێو قەفەزێکم و... هێدی هێدی و گران باڵەفڕەم پێ کەوتووە و دەمخواست پڕ بەسییەکانم هەوای پاک هەڵمژم، دەستم لە بەردەکان دەدا و خەنی دەبووم، وەک بزنەکە خۆم لەو خاک و خۆڵ و گیاوگۆڵە وەردەدا، بەدەم سەرمەقولاتەوە قاقام دەنێو خەرەندی دەم کراوەدا دەنگی دەدایەوە، بەتەلانێکدا تیژ سەرکەوتم و ڕوانیم وا لە خوارەوە مەڕ و بزنەکان سەریان دەنێو سەوزاییەکەی بەردەمیاندا نوقم و بزر کردووە، هەر دەت وت کۆمەڵێک حەیوانی بێ سەرن و لەوێدا ڕواون، بزنە شێت نەبێ، تەنیا و تۆراو لە بەهار و گیاوگۆڵ، سەرکز و ڕەنجاو لە هەتاو خۆی دابووە ژێر دەوەنێک، پشتی لە مێگەل و ڕوو لە تەلان کە منی غل دەکردەوە، بەڵام ترسنۆک و زەندەقچوو لە گۆچانی سیامەند، نەدەجوولا، سەیر بوو بەلامەوە... لەو بەهارە تەڕ و سەوزەدا بزنە شێت ئەوەندە غەمگین و ئەوەندەش لەڕولاواز بێ، دەت وت گوێی لە هەناسەم بووە، لە مشەمشی پاش غارغارێنم، هەردوو گوێیەکانی قوڵاغ کردن، من دەمزانی کە چەندە حەز لە بازبازێن و بازرقەی شێتانە دەکا و هەستم دەکرد دوند و بەردەڵان و ڕەوەزەکان بانگی دەکەن و ئەم غیرەت ناکا یەک بست لە ڕانەکە دوور

بکەوێتەوە، ڕێک سەیری ئەو شوێنەی دەکرد کە من لێی دەرکەوتم، بێ ئاگا لە خۆی یان لە تاو بێزارییەکی پاش دیلکردنێکی درێژخایەن، یاخود لەتاو برینەکانی لەش و جێ گۆچانەکانی سیامەند تێی تەقاند و سەرەتا کەوتە نەرمە غار، ئیدی من لە خۆشیانا باخڕەم دەهاتێ و گەشکەم دەگرت: پاشان بێ باک لە غەزەب و دلڕەقی سیامەند وەک ئەوەی بانگم بکات، بەیادی جاران بکەومە دوای، لەوە دەچوو غاردان و ڕێ ڕۆینی لەبیر چووبێتەوە، یان وەک کارژۆڵەیەکی تازە لە دایکبوو دەکەوت و ڕەتی دەبرد و هەڵدەستایەوە، گێژوگێڕ لەتری دەدا... هەر دەت وت بەشەرمی هەزار بزنی سەرشکاو و ملکەچەوە شەرم لە بازرقە و غارغارێنی خۆی دەکا، من بێ سلاوکردن لە سیامەند کەوتمە دوای، ئەویش سەرسام و ئەبلەق لە هەردووکمان ڕادەما و بەگۆچان لە داروبەردی دەدا و دەت وت سەرگەرمی قاشوانێیە، بەرد بەر بەرد دەکەوت و گەر تەڕی سەوزەگیاکان نەبووایە، لەوەدابوو پڕیشکی ئاگر دارودەوەنەکان بسووتێنێ، لە داخانا بەگۆچان لە لمووزی چوار پێنج بزنی دا کە بێ گوناهانە دەلەوەڕان، دیسانەوە کوێرە ڕێیەک هەردووکمانی کرد بەڕێبوار... من بەئەنقەست گران غارم دەدا... دڵم نەدەهات پێشی بکەوم، دواجار ویستم بیگرم و لە باوەشێی بگرم و بۆنی بکەم، لە غار نەدەکەوت... دەنێو کۆمەڵێ گاشەبەرد و دارودەوەن و ڕەوەزدا لێم بزر بوو، منیش وەکو بزنەکە گێژوگێژ لەپەڕوو دەکەوتم و هەڵدەستامەوە، لە هەستانەوەیەکدا دۆزیمەوە، گەیشتبووە سەر هەڵەمووتێک کە بەسەر هەڵدێرێکدا دەیڕوانی... بە دە دوانزە هەنگاو دەچۆوە سەر خەرەندی هەزار بەهەزار، بەدوو پێی دزێک و زۆر بەئاسپایی لێی نزیک دەبوومەوە، زانیم زۆر زەحمەتە بگەمە ئەو شوێنە زۆر عاسێیە و بیهێنمەوە، لەسەر ئەو دوندە زۆر ڕکەدا نە ڕێی هاتنەوەی هەبوو... نە ڕێی دەرچوون، بەترسەوە لێکدی ڕاماین، من لە ترسانا هاواری سیامەندم کرد کە فریامان بکەوێ، ئەم لە پشت دارودەوەنەکانەوە وتی:

«**لێی گەڕێ ئەجەلی هاتووە!**».





خودا هاوار... بەبەرچاومەوە وەک کەسێک بیەوێ خۆی بکوژێ و خۆشەویستترین کەس بکات بەشایەت؛ بزنە شێت بەدەوری خۆیدا خولی دەخوارد و دەیقاڕاند، من بەچنگەکڕێ هەوڵم دەدا لێی نزیک ببمەوە، دەترسام تا من دەگەمە لای خۆی هەڵبدا، یان هەڵدێرێ و هەپروون بەهەپروون بێ، وەک ئەوەی تۆڵە لە من و سیامەند و باوکم و هەموو دونیا بکاتەوە، من دەشمزانی جگە لە من کەس بەمردنی بزنە شێت مات و مەلوول نابێ، هەقی بوو خۆی بکوژێ لە داخی سیامەند کە دواجار توانی ملی پێ کەچ بکا، تۆڵە لە باوکم کە ساڵی دوو جاران کێردی دەخستە سەر ملی بەبیانووی ئەوەی بیکا بەقوربانی، تۆڵە لە من کە بۆچ ئەوەندە فەرامۆشم کردووە، وەک دوو عاشقی نائومێد چاومان لە یەکدی بڕیبوو، من هەر هەموو ئازای جەستەم وەک بینی ئاو دەلەرزی، بزنە شێت غەمگین... بەڵام ئەمجارەیان پڕ فیز و هەوا لە من و داروبەرد و ئاسمانی دەڕوانی... دەیویست پێم بڵێ کە ئەم هەر بزنە شێتەکەی جارانە و لە هەڵبەز و دابەزین و بێعاری ناکەوێ، هەر عاشقە تەلان و دوند و هەڵەمووت و شوێنی زۆر عاسێیە، هەروەک بڵێی بەیادی هاتبێتەوە کە ڕۆژانێک لەگەڵ مندا ئازاد و ئازا بووە و هەرگیز بەو ملکەچکردنە ڕازی نییە، بەبەرچاوی منەوە چەند جارێک بەدەوری خۆیدا خولایەوە، وەک ئەوەی گۆچانی بەزەبری سیامەندی بەرکەوتبێ و گێژ و کەللە کاس هەر دەخولایەوە، دوا نیگای چاوە زەردەکانی شپرزەی کردم، لەسەر ئەژنۆ بووم کە هەستامەوە سەر پێ و ڕێک ڕووەو هەڵەمووتەکە بازێکم دا... فریا نەکەوتم... خۆی هەڵدا... وەک هەر عاشقێکی نائومێد و تۆراو لە یار و لە دونیا خۆی هەڵدا... خودا هاوار من چیم دی... بەبەرچاومەوە بەر کەرتە شاخەکان دەکەوت و پارچە پارچە دەبوو... ڕووەو قووڵایی خەرەندەکە سەرانگرێ دەبوو... کە بەگوژمەوە بەر کەرتە شاخەکان دەکەوت گاشەبەردی زەلام زەلامی لەگەڵ خۆی ڕادەماڵی و هەر دەت وت کێوێک دەڕمێ و سەدەها ڕەوەز لە بن و بۆتکەوە هەڵتەکیون، لاشەی بەر درەختەکانی قەدپاڵ

دەکەوت و لەگەڵ خۆیدا خەرەندەکەی پڕ دەکرد لە شکانی لقەکان و... هاوار و قاڕینی بێ ئامان؛ هەر دەت وت هەزار بزن بەیەکەوە هەڵدێراون، هاواری بەر لە مردنی دەگەیشتە عەرشی فەلەک و پڕ بەخەرەندەکە دەنگی دەدایەوە، مەڕ و بزنەکانی دیکە لە لەوەڕ دەکەوتن و بەترسی قووڵی بەر لە سەربڕینەوە، بۆ پاش و پێش، ڕەتیان دەبردو و تێک دەقژقژان، بەردەکان لە ڕەوەزەکان دەبوونەوە و بەر یەکدی دەکەوتن، لە ترسی ئەو دارمانە پۆلە مەل لە کونە شاخەکانەوە ڕووەو ئاسمانی سەر خەرەند هەڵدەفڕین و بەریەکدی دەکەوتن، هەموو شتێک لە بەر دیدەی مندا ئاراستەی خۆی ون کردبوو، من دەمزانی بەدەم هەڵدێرانەوە مێشکی جوانی دەپژێ، ناو هەناوی بەسەر درەختەکانەوە جێ دەمێنێ و ڕیخۆڵەکانی درێژ و لوول لە لقەکانەوە دەئاڵێن، چاوەکانی کوێر دەبن و ددانەکانی هەڵدەوەرێن، تیسکی بەسەر پنجکەکانەوە جێ دەمێنێ، تا لە چاوانم ون بوو دە جاران بینیم بەر کەرتە شاخەکان دەکەوت و بەدەم ڕێوە لقە درەختەکان لەژێر گرانایی لەشی خوێناویدا دەشکان و لێرە و لەوێ بۆشایی خەرەندی دەبڕی... تا هەنووکەش قاڕەقاڕی خوێناوی بزنە شێت هەر لە گوێمدایە... خۆ هەڵدانەکەی... کپ بوونەوە و خامۆشی دوای مەرگی بزنەکە و هاڕەی دارمانی گاشەبەردەکان و جێگیربوونی دوا بەردی گەرم و ساردبوونەوەی لەناو چەمی قووڵایی خەرەندەکە، سەدەها شەو بەدەم زریکەوە... بەدەم هەنسک و گریانەوە لە خەو هەڵدەستام و لە خەونما بزنەکەمم دەدی کە چۆن دەستم دەگرێ و دەمباتە سەر لاشەی ئەنجن ئەنجن بووی خۆی... پێم دەڵێ:

**«گەر منت خۆش دەوێ با بەیەکەوە بمرین!»**.

لەو خەونانەدا هەر هەموو ئازار و دەردی خۆی بۆ گێڕامەوە، هەرچییەکی کە بەدەست سیامەندەوە چەشتوویەتی، من ترسنۆک بووم... ترسنۆک... چونکە بەوە ڕازی بووم بچمەوە سەر تەختە ساردەکانی مەکتەب، قایل بووم دایکم لانکی خوشک و براکانی خۆم پێ ڕابژەنێ و نقە نەکەم، باوکم تف لە نێوچەوانم بکات و نەهێڵێ بیسرمەوە، چۆن لە هەموو وانەکان





کەوتووم و هەرگیز نابم بەپیاو، هەموو دەیان وت: ئۆخەی لە بزنە شێت قورتارمان بوو... من دەگریام و بێ غیرەتانە فزەم نەدەکرد، بزنە شێت سەلماندی لە من ئازاترە؛ ئەو کاتەی لە گۆچانەکانی سیامەند هەڵگەڕایەوە، من... منی چکۆڵە و بنەپیاو هەردوو ناولەپم بۆ حەیزەرانەکانی مامۆستا عوسمان دەکردەوە، لەبەر چاوی قوتابییەکان گوێی ڕادەکێشام و پێی دەوتم:

**«تا زەنگ لێ دەدا ڕوو لە دیوار بکە و لای تەنەکەی زبڵەکە لەسەر یەک قاچ بوەستە، قاچەکەی دیکەت بەر زەوی بکەوێ حەیزەرانێک دەخۆی!»**.

بەدزییەوە، کلۆڵ و بێ دەستەڵات، لەلای شیرین بۆ بزنەکەم دەگریام و ئەویش لەگەڵما دەگریا... پێم دەوت:

**«شیرین... بزنەکەم لە من ئازاتر بوو!»**.

شیرین، دایکانە هەردوو دەستی دەگرتم و دڵی دەدامەوە:

**«نابێ فەرهاد... نابێ خۆت بکوژی... نابێ... خۆ تۆ بزن نیت... تۆ دایک و باوک و نەنکت هەیە... خوشک و برای زۆر... گەر شتێکت لێ بێ من قسە لەگەڵ کێ بکەم... ها... من هاوڕێی کچیشم نییە؟»**.

دەمویست وەک عاشقە دۆڕاوەکانی ناو حەکایەتەکان خۆم بکوژم، بەڵام من شوانێکی دۆڕاو و قوتابییەکی تەمبەڵ و عاشقە چکۆڵەیەکی کەڕولاڵ و هیچ و پووچ بووم، خودا هاوار چەندین شەو لە باوەشی نەنکمدا هۆن هۆن دەگریام سیامەندیش بۆ دەغەزارکردنی من بەباوکمی دەوت:

**«مامەگیان خەمی پێ مەخۆ... ئەجەلی هاتبوو... ئیدی دەروازەی خێر و بەرەکەتمان لێ دەکرێتەوە»**.

باوکم بێ باکانە دەی وت:

**«قوربانی خۆمان بێ... هەر خۆم بەتەما بووم سەری ببڕم... چاوی سوور ببوو»**.

حەکایەتەکانی نەنکم و دڵدانەوەکانی شیرین دادی نەدام، تەواو... بەتەواوی دڵم لە مەکتەب تۆرا، بۆ جارێکی تر لە «کۆی کۆششی ساڵانە»

لە هەر هەموو وانەکان کەوتبوومەوە، کە سیامەند پێی زانی زۆری لێ پاڕامەوە، بێ هوودە بوو... پێی وتم:

**«بۆ هاتنەکەت بۆ لای بزنە شێتەکەت لێمان شاردەوە... بۆ مەکتەبەکەت عەیبە درۆی لەگەڵ بکەین...»**.

سیامەند ڕقی دونیای لە من بوو، حەزی دەکرد لەبەرچاوی ئەو ورد وردم بکەن، بزنەکەمی کوشت، دەیویست منیش بکوژێ، دواجار پێی وت و باوکەش فەلاقەی کردم و پاشان بەدار هەنجیرەکەوە هەڵیواسیم، هەردوو دەستی پێ بەرز کردمەوە، گوریسێکی هێنا و بەچوار پێنج قەد ئاڵاندییە قەدمەوە، ڕێک لە بن باڵەکانمەوە و شەتەکی دا و گرێیەکی توندی لەسەر سینەم کرد بەنیشانە، دایکم بەدیارمەوە دەگریا و باوکە لێی دەخوڕییەوە، خوشک و براکانیشم لشمە لشم چڵمیان دەسڕی و لە دوورەوە و لەبن هەیوانەکەوە، زارەترەک و هەترەش چوو، دەگریان و لە هەڵواسینەکەی من ڕادەمان، نەنکم لە خوا دەپاڕایەوە کە هیچم لێ نەیەت، پوورە زولەیخاشم لە پشت پەنجەرەکەوە بڕوای بەچاوانی خۆی نەدەکرد، بەلقێکی ئەستوورەوە هەڵیواسیم و تەنەکەیەکی خستە ژێر پێم، بەئاستەم قاچەکانم بەری دەکەوتن و دەمویست خۆم ڕاگیر بکەم، گوریسەکە هەردوو بن باڵەکانی دەبڕیم، مەلەکان شەرمیان لە من نەدەکرد و وایان دەزانی من داهۆڵم... لەسەر هەنجیرەکە دەنیشتنەوە، گەڵاکان بێ باک لە ئازاری من دەشنانەوە، کتوپڕ باوکە لەقەیەکی لە تەنەکەکەی ژێر هەردوو پێم دا، هەردوو لاقم بەحەواوە ڕادەوەشاند، گوریسی بەستراو بەبن هەردوو باڵمەوە پتر هەڵدەکشا و دەیتۆقاندم، بەجۆڵانە کەوتبووم، باوکە بەدیارمەوە وەستا، دەترسام بوەستێ تا گوریسەکە هەردووبن باڵەکانم دەبڕێ، بەزۆر هەناسەم دەدا، گوریسەکە لەسەر هەردوو مەمکم شەتەک درابوو، لەوە دەچوو هەردوو گۆی مەمکم زامار بووبن، نەمدەوێرا هەردوو دەستەکانم لە لاشەم جودا بکەمەوە؛ نەبا لەشی گرانم هەردوو شەپیلکەکانی شانم دەربێنێ، تا بێزار بوو وەستا و پاشان هەڕەشەی لە هەمووان کرد... یەکە یەکە سەیری کردن و وتی:





**«کێ لە دارەکەی بکاتەوە... هەڵیدەواسم!»**.

هەتا دەهات چاوەکانم دەردەپۆقین و شتەکان لێڵ و وێڵ دەبوون، هەر کە لە دەرگای حەوشەی چووە دەرێ دایکم و نەنکم و خوشک و برا و پوورەکانم، بەدەم هاوار و وەیڕۆ... وەیڕۆوە گەمارۆیان دام، هەر زوو تەنەکەکەیان خستەوە ژێر پێم، کردیان بەغەڵبەغەڵب و کەس نەیدەوێرا چاو لە هەڕەشەکەی باوکم دابخا و گرێبەندی گوریسەکەی سەر سینەم بکاتەوە، تێک دەئاڵان و دەستیان بەیەکدا دەدا، قاووقیژی پڕ ترسی ئەوان دەرودراوسێ نزیکەکانی ڕژاندە ناو حەوشەکە، دواجار نەنکم پێی شەرم بوو لەبەرچاوی ئەو حەشاماتە دۆش دابمێنێ، بەکوڕە گەنجەکانی وت کە گرێی سەر سینەم بکەنەوە... بەتووڕەییەوە وتی:

**«با لە جیاتی تۆ باوکت من هەڵبواسێ!»**

بەدیار کردنەوەی گرێ کوێرەکانی گوریسەکە هەر هەمووان لە خەمم دابوون و گوێم لە گریانی بەکوڵی کچ و ژنەکان بوو، من لە دڵەوە قێزم لە خۆم دەبۆوە چونکە وەک بزنەکەم ئازا نەبووم، ئەو هەموو ملکەچییە و خۆم نەدەکوشت، کێ بوو نەیدەهێشت بچمە سەر خەرەندەکە و بکەومە دوای ڕۆحی شێتانەی بزنەکەم؟ شیرین بوو؟ نەنکم؟ دایکە؟ ترسی خۆم یان حەکایەتەکانی نەنێ؟ کێ بوو؟ شەوەهای شەو خەونم دەدی کە کتومت وەکو بزنەکەم ڕووەو قووڵایی خەرەندەکە هەڵدێراوم، بەدەم ئازاری سەرمەوە کە بەر تاشەبەردەکان دەکەوت و پڕ بەخەرەندەکە دەمقریشکاند، دەمدی چۆن ڕیخۆڵەکانم لە لقی درەختە ڕواوەکانی قەدپاڵە زۆر ڕک و لێژی خەرەندەکە گیر دەبوون و جێ دەمان، خۆم دەبینی بەڕیخۆڵەی خۆمەوە بەدرەختێکدا شۆڕ بوومەتەوە و لە هاژەهاژی چەمی ناو خەرەندەکەم دەڕوانی کە دوای پچڕانی ڕیخۆڵەم سوڕ دەمزانی ڕووەو ئەو خەرەندە هەزار بەهەزارە سەرانگرێ دەبم و لەو چەمە شێتەدا دەخنکێم... لە ترسانا، دیسانەوە، لە هاوار و قیژەی خۆم وەئاگام دەهاتم، دایکم بەدەم بیسمیللا و قول ئەعوزو... و ئایەتەل کورسییەوە شایەتمانی دەهانی و دەیگرتمە باوەش،

نەنکم کە هەرگیز نەدەنووست بەهەڵەداوان کوت و کوێرانە ساتمەی لە شتەکانی ناو ژوورەکە دەکرد و دەهات بەهانامەوە، بەنۆرە لە ئامێزیان دەگرتم، من لە باوەشی هەردووکیاندا هەڵدەلەرزیم و جارێکی دیکە لە باوەشی نەنێ و دایکەدا لە ترسی خۆم دەبوورامەوە و خەونێکی ترسناکتر و هاوارێک و ڕاچڵەکان و لێوە لەرزە و... ئیدی ژیانی من دوای بزنە شێت ببوو بەمۆتەکەیەک کە هەرگیز لێی وەئاگا نەدەهاتم، ئیدی بەردەوام دایکم و نەنکم لە نێوان خۆیاندا دەیانخەواندم، خودایە من چەندە بەدبەخت بووم... چەند ڕۆژێک دواتر بێ ئاگا لە خۆم... بێ ئاگا لەوەی کە ڕووی دا و نەخۆشی خستم و ئیدی هەرگیزاو هەرگیز لێی ڕاست نەبوومەوە... وەک هەر بەیانییەکی شووم لە ژینی مندا... شیرین دەیزانی چەندە پەرێشان و غەمگینم، زووتر و... بەر لە هەموو قوتابییەکان هاتبوو دڵی من بداتەوە، ئەو بەیانییە بێ ئاگا لە خۆم ئەوەندە بۆ بزنە شێت گریام لە باوەشی شیریندا ئاگام لە خۆم بڕا، ئەویش هێدی هێدی بەدەستەسرە گوڵدارەکەی فرمێسکی منی دەسڕی، لە من بەستەزمانتر و بێ دەستەڵاتتر تەپڵی سەرمی ماچ دەکرد و... دووبارە و دە بارەی دەکردەوە:

**«دە مەگری... دە بەس بگری... دە مەگری... ئەگەر کوڕەکان بێن گاڵتەت پێ دەکەن... دە عەیبە...!»**.

هەردوو دەستی منی خستبووە ناو دەستە خڕپنەکانی، جگە لە شیرین کەسم دەست نەدەکەوت پڕ بەدڵی خۆم بۆ بزنەکەم کوڵی دڵی پڕم هەڵبڕێژم، شیرین زۆر لەوە وردیلە و چکۆڵەتر بوو وەک دایکم یان نەنکم لە باوەشێم بگرێ... وەلێ دەستە نەرمەکانی، سەری پەنجەکانی، ژێر نینۆکە کەمێک درێژ و چڵکنەکانی، ڕەنگی پەڕیوی لە داخی خەمی من، هەناسەی نارێکی، قسە پچڕ پچڕەکانی، بۆن و بەرامەی سینەی زۆر ساوای، قژی پەخشی بەسەر ڕوومدا، هەردوو کوڵمی دەرپەڕیوی کە هەتاو گەستبوونی و تەواوێک شەمزابوون، چاوە تەڕ و ڕۆشنەکانی، لێوە لەرزەی... هەر هەمووی بۆ من دونیایەک بوون لە سۆز و میهر و جوانی... گەلێک لە هی





دایکم و نەنکم و هەموو دونیا زیاتر، لەو بەیانییەدا و لە پاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێکیش لە مەرگی بزنە شێت من هەر هەموو ترسێکم بیر چووبۆوە و سەرم لەسەر ڕانی بوو... نەخۆشانە مت ببووم، لە دوو مەلی غەمگین و تەڕە و باڵ شکاو دەچووین، لە دوو منداڵی دەرکراو لە دونیا، لە دوو کەروێشکی ترسنۆک... بێ ئاگا لە خۆمان، کتوپڕ، مامۆستا عوسمان و دەرگاوانی بەڕێوەبەر پۆلەکەیان بەهات و هاوار داگیر کرد، بەیەکەوە هێدمەگرتی بووین و ڕاچڵەکین، مامۆستا عوسمان بەم دیمەنەی من و شیرین شێت و هار بوو... مەچەکی ڕاستەمی گرت و وەها بەرزی کردمەوە کە هەردوو پێم بەحەواوە جۆلانەیان دەکرد، هەر بەشەق تا ژووری بەڕێوەبەر بردمی و... بێ ئاگا لە خۆم شەقێکی بەر گونم کەوت... وەها بەزەبر بوو کووڕی کردمەوە، قیامەتم بەچاوی خۆم بینی، ئەو ڕایدەکێشام و من گەلاوگەڵ بەدوایدا دەخشیم... دەت وت کەچە جلێکم بەدەستییەوە، هەر لەوێدا دەرگاکەی لەسەر داخستم و بەشەپازللە و پێلەقە وڕوکاسی کردم... نەخۆشی خستم، خودایە... لەوە ناخۆشتر چییە لە باوەشی شیرین دەرت بهێنن و بکەویتە ژێر چنگی دڕندانەی مامۆستا عوسمان... بەدەم لێدانەوە دەی وت:

**«سەگی سەگباب... هەر دەتکوژم...!»**

من نەمدەزانی چۆن و بۆچی بەو بەیانییە زووە پەیدا بوو... دەرگاوانی بەڕێوەبەریش لەوە بەستەزمانتر بوو گومانی لێ بکەم، زەحمەت بوو بزانم دوای من شیرین چی بەسەر دێ... چی لێ دەکەن؟ نەمدەزانی... دەترسام پەنجەکانی لەژێر حەیزەراندا داڕزێنن، لەو ژوورە داخراوەدا سەد تفی لێ کردم، دەمویست تفەکان بسڕمەوە... کەچی نەیدەهێشت، پڕ بەژوورەکە هاواری دەکرد:

**«بێ ئەدەب... تفی من بەپیس دەزانی... بەشەرەفم لەم مەکتەبە دەرت دەکەم... بەئیمانم لە ئاودەستخانەکە حەپست دەکەم... کەر کوڕی کەر... بەم بەیانییە زووە کەس هاتووە بۆ مەکتەب؟ بەشەرەفم هەر دە نمرەی ئەدەبەکەت**

**لێ دەستێنمەوە... هەی بێ شەرەف!»** .

بەبۆکس لەناو دەمی دەدا و بەو تامی سوێرییەی سەر زمانم زانیم دەمم پڕ بووە لە خوێن، لەو بەیانییە زووەدا جگە لە خودا کەس نەبوو فریام بکەوێ، دەرگاوان هەردوو دەستی خستبووە ناو گەڵی و لە دوورەوە و لە ترسی ئەم لێدان و کوتانە هەڵدەلەرزی، نەبا زەبرێکی دیکە بەر گونم بکەوێ و لە ترسانا هەردوو ڕانم بەیەکەوە نووساندبوو، بەلەقە دەیکێشا بەسەر ئەژنۆکانمدا، بەدوو پەنجەی گەورۆنە و شایەتمانە تووکی پشت گوێی ڕاستەمی دەردێنا، کتوپڕ دڵم داخورپا، لەوە دەچوو شیرین لەودیو دەرگاکەوە بێ و جورئەتی ئەوەی کردبێ بەدوامدا هاتبێ، گوێم لە قرخە قرخی سینەی بوو کە بەدەم گریانەوە دەخنکا، هاواری لە دەرگاوانەکە کرد:

**«ئا بڕۆ... ئەو دەڵەقۆڕی عەییارە لێرە نەمێنێ و بیبەوە ماڵی باوکە گەوادەکەی!»** .

ئەو جنێوە ڕۆحی ساوامی دەرهێنا، هەلاهەلای کردم... نازانم بۆ دوعاکانی نەنکم بیر کەوتەوە: خودای عاسمانان فریام کەوە... ڕووڕەشی دونیا و قیامەتم... سەگی بەر قاپی چاک و پیرەکانتم... خودایە وەک تاژی دەلوورێنم... شەرمەزارم و ڕووم نایە سەر هەڵبڕم و سەیری ئاسمانت بکەم... لە گوناهەکانم خۆش بە... منم تاوانبار تا ڕۆژی مەحشەر... لە دڵەوە و بەدزییەوە وەک گورگی بریندار دەملووراند و لە خودا دەپاڕامەوە من و شیرین بەتەنیا بەجێ نەهێڵێ و ڕزگارمان کا، کتوپڕ بەڕێوەبەر لەناو دەرگاکە وەک دێوی ناو حەکایەتەکان، دێوێکی زەبەللاح، پەیدا بوو، ڕووناکی بەرەبەیانی لێ گرتم و ژوورەکەی تاریکتر کرد، هیچم نەدەدی... مامۆستا عوسمان بەدەم کەفکردنی هەردوو لالێوی و چاو دەرپۆقینەوە حەکایەتی ئەو بەیانییەی وەها ناشیرین و بێزەوەرانە بۆ بەڕێوەبەر گێڕایەوە کە ئیدی خۆم حەزم دەکرد ببمە دڵۆپێک ئاو و خاک هەڵممژێ، حەزم دەکرد هەر لەو ژوورەدا بکەوم و بمرم... بەڕێوەبەریش بەدەم داکەندنی چاکەتەکەی و شلکردنەوەی قەرەوێتەکەی دەی وت:





**«تۆ وازی لێ بێنە... من چاری دەکەم...!»** .

هەر بەتف سواغی دام، هەر شوێنێک لە لەشمدا شەپازللە و کۆڵەمست و لەقەی مامۆستا عوسمان-ی بەر نەکەوتبوو... بەڕێوەبەر میهری نواند و... تەواو نەخۆش و ماندووی کردم، چەندە ترسنۆک بووم، چەندە بێ ڕۆح و هەوا... چەندە غیرەت سز... من فەرهاد-ێکی دۆڕاو و بەزیو بووم، شیرین-م بەتەنیا جێ هێشت و نەموێرا لێیان بپرسم ئاخۆ بەم بەیانییە زووە چی لێ دەکەن... خودا هاوار... وەک من جێی مەهێڵە و فریای کەوە، من زەندەقم چووبوو باوکی وەک خوشکە گەورەکەی بیکوژێ، ڕووەو ناو خەرەندەکە هەڵی دێرێ و وەک بزنە شێت هەڕپروون بەهەڕپروون بێ، من فەردهاد-ێکی ڕسوا بووم، گرگن و لەرزەلێو، بەقەد بزنەکەم ئازا و مەرد نەبووم... یەک جار بمرم و تەواو، من هەموو ڕۆژێک دەمردم و لە هەموو شتێک بووم، لە قوتابخانە، لە بزنە شێت، لە شیرین، لە حەکایەتەکانی نەنکم، لە هەوای بۆنخۆشی شاخان... کەچی سەیر بوو... هێشتا بەزۆر دایکم و باوکم و نەنکم... شیرین... دەیانویست من هەر بژیم... هەناسە بدەم... پاروو بگلێنم... بنووم... موتاڵا بکەم و... لە وانەکانیش نەکەوم...

کە چاوانم کردەوە... لەژێر لێفەیەکی قورسدا خۆم دیتەوە، نەنکم بەدەم سەر لەرزینەوە بەسەرمدا دەگریا و پەڕۆی تەڕی دەخستە سەر نێوچەوانم، لەوە دەچوو قسەم بیر چووبێتەوە، ویستم بپرسم: چی بووە نەنێ؟ بێ پرسیار ڕۆڵەکەم، زێدە جەرگم... تۆزێک شۆربام بۆ کردووی... دوو کەوچکی لێ هەڵقوڕێنە... هەر لەبەر خاتری پیرە نەنێ... گریام... گریام، لەو ساتەدا کە چاوانم کردەوە حەزم دەکرد شیرین و بزنەکەم لە ژوورەکە بوونایە... نەنکم ڕایچڵەکاندم کە وتی: ڕۆڵە شیرینەکەم... بیخۆ... دەنا دەمری... چەند ڕۆژە زەوادێک نەچۆتە سەر زمانت، کتوپڕ دایکە هات و بەخۆی و کۆتکە شیرێکەوە کە هەڵمی لێ هەڵدەستا، دوایی زانیم کە من هەر لەو بەرەبەیانییە شوومەدا و لە ژووری بەڕێوەبەرەکەدا بووراومەتەوە... ڕەنگ زەرد و پرزە لێ براو، چاوانی غەرقم لە فرمێسک، وشک هەڵاتنی لێوم،

داکەوتنی پێڵـووەکانم و تەوێڵی گەرمم، تۆرانم لە ئاو و نان وای کـردبوو زۆر بەترس و شـەرمـەوە ڕێز لە ڕاکـشـانم بگرن و... هەر هەمـوو دەست بەدوعـاوە دەپاڕانەوە نەمرم، لە هەموو ژیانمدا ئەوەیان تاکە جارێک بوو کە من بێ باک بم و ئەوان زەندەقچوو، جۆرە لەزەتێکی شەیتانانەم لەو دەردە دەبینی، سوپاس بۆ نەخۆشی و ترسی مەرگ... سوپاس بۆ فرمێسکەکانم و هەر چوارپەلی مـردووم کـە نەدەجـوولاّن... سـوپاس بۆ زریکە و هاوارم ئەو وەختەی دەیانویست لەسەر پشت خۆ وەرگێڕمە سەر تەنیشت، دەمویست دلێرانە پێـیان بڵـێم: من تەواو... تەواو... بڕیارم داوە ئیـدی بمرم... بلاّوەی لێ بکەن... کەستان دایک و باوک و نەنکی من نین... ئێوە خوشک و برای باشی من نین... ئیـدی تەواو من نایەمـەوە ناوتان، دەبێ بەحـەسـرەت بن وەک کوڕێکی برسی و گوێڕایەڵ لەسەر خوانتان دابنیشـمەوە، زرمەزلێ و گەمـە و شەڕەشـەق تەواو... سوێند بەمەرگی بزنە شـێت نەچمەوە ئەو پۆلە ساردە، سوێندبێ بەتۆرانی شیرین نەچمەوە سەر ئەو تەختە ڕەقەی بزمارە هەڵوۆقیوەکانی شەرواڵەکەم دەدڕێنن، بابەس بێ بەزەبری شەق و حەیزەران ئایەتی درێژ و سرووود لەبەرکـردن... هەزار تف لە مـاتماتیک و مـامـۆسـتـا ناشـیرینەکەی، دەمـویست مـەرج دابنێم و بڵـێم: یان من یان مـامـۆسـتـا عوسە... یان دەمرم یان ئەو لەو قوتابخانەیە و ئاوایی دەربکەن، گەر باوکی شـیـرین تفـێکی لە شـیـرین کـردبێ... یان دایکی جنێـوێکی پێ دابێ... مـامـۆسـتـا عـوسـمان یەک حەیزەرانی لێ دابێ: بەڵێن بێ و پەیمان کـە لەم دەردە ڕاست نەبمەوە، دەمـویست بەهەموویان بڵـێم: سوێندبێ بەمەرگی بزنە شێت نەبمەوە کوڕ و براتان... نەبمەوە هاوڕێ و دراوسێتان... یان دەمکەنەوە بەشـوان یان لە شـیـر و مـاستی بەیانیـان دڵم دەتۆرێنم، یان باوکـە دەبێ بەئینسـان و بەباوک و چیـدیکە هەڵم ناواسێ یان وەکو بزنە شـێت خـۆم هەڵدەدێرم و خـۆم سەرنگوم دەکـەم، بەڵام زمانم نەبوو هیچ بڵـێم... گـەرچی کەڕولاڵ بووم... بەڵام لەوە دەچوو گوێیان لەو سوێندانەی ناو دڵم بووبێ... یەکـەم جـاربوو بەدوو چاوی تەڕەوە لە یەکـەیەکـەیان ورد ببـمـەوە و ڕۆحی





زەلیل و پەژمـووردەیان بەڕووتی ببـینم... بەدوو چاوی زیرەک و زیندووی بزنە شێت ئاسا ئەو کاتەی لە خۆری درەوشاوەی تاقی ئاسمانی دەڕوانی، ژوورەکـە پڕ ببـوو لە خەڵـک، لە دەرودراوسێی شپـرزە، لە خـوشک و برای شـەرمن و ترسنۆک، لە بۆنی قـورسی باوکم کـە پێی شـەرم بوو لەناو دەرگاکـەوە بێـتە ژووری و بەسـەر کوڕە نیـوە مردووەکـەیدا بنوشـتێـتەوە و مـاچی بکا؛ کـوڕێک کە بۆ ئەو جگە لە ڕسوایی هیـچی دیکە نیـیـە... نە شوانە و... نە مەکتەبلی و... نە تڕی بەرانەکەی، بەزەحمەت دەموچاوەکانم لە یەکدی جیا دەکـردەوە، دەروێشانە سەریان دەلەقاند... لێم ڕادەمـان کە چۆن وا بێ باک و ئازا نـان ناخـۆم و دەمـەوێ بمرم، کـە دەمـدی لە مـەرگم دەترسێن سینەم پڕ دەبوو لە هەوا و فیز، ئەو دەردە کردبوومی بەقەڕوحترین مێردمنداڵ، دەمویست تۆڵەی مەرگی بزنەکەم و لێکدابڕانی ئەو بەیانییەی من و شیـرین لە هەمـوو ئاوایی بکەمـەوە، دەمـویست فـێریان بکەم و بزانن کە من بێ یادی جوانی شیرین و بزنەکەم جگە لە مەڕێکی گێژ و ملکەچی ناو مـێگەلەکـەی باوکم هیـچی دیکە نیم، مـەڕێکی لەڕ کە بۆ قـوربانی ڕادەگـیـرێ و قـەڵەو دەکـرێ، ڕۆحی بزنەکـەم هاتبـووە ناو ڕۆحی من و دەمویست لە هەموو ڕاستەڕێیەکان لابدەم کە لەمەودوا دەکەونە سەر ڕێم و بێ باک و کەللەشەق شەرم لە هیچ شوانێک نەکەم و چڵە گیا حەرامەکان بخـۆم، من تەنهـا ئەو کـاتە تێگەیشـتم کـە کەس ناتوانێ: نە باوکـە، نە بەڕێوەبەر، نە مـامـۆسـتـاکـان، نە دایکە، نە هاوەڵە چەتوونەکـانم، نە سیامەندی کەللەبەران... کەس... کەس ناتوانێ لێم بدا، تفم لێ بکا، گوێم ڕابکێـشێ، نقـورچم لێ بگرێ، لەسـەر یەک پێ و لە پۆل یەک دەرس ڕامبگرێ، دەمـتوانی وەک بزنەکەم بەسـەر شاخەکـاندا هەڵزنێم و بەناو بەردەڵانەکـاندا بازبازێن بکەم، دەمـتوانی بەڕووی هەمووانـدا هەڵشاخێم، من تا ئەو کـاتە نەمـدەزانی نەخـۆشی و مـەرگی من لە هی بزنەکـەم ترسناکـترە، دەی... کـەواتە سـوپاس بۆ مـەرگ و دەردەداری کـەوا دەکـا کـەسـوکـاری هیچ بۆ دواجـار ڕێزت لێ بگرن، ناو دەمم ببـوو بەپەلاس...

وشک و تاڵ... چەند شەو و ڕۆژ ئاواهی یەک تەختە کەوتبووم؟ نازانم... بۆنی قورسی ئارەقەی لەشی خۆم هەراسانی کردبووم، ژوورەکەم تەنگ و ژێربۆن کەوتوو، بەدەستی ڕاستە کە بەرزم کردەوە بەو نیازەی کە پێیان بڵێم: دەی بڵاوەی لێ بکەن... وەک فەرماندەیەک بەگوێیان کردم و بەری هەناسە و هەوایان بۆ بەرەڵا کردم، ژانێک لە بڕبڕەی پشتمەوە دەهات و دەمارەکانی ناو چاوانمی گەرم دەکرد، لەگەڵ خوێنمدا بەهەموو لەشمدا ڕێی دەکرد، چرایەک کز دەسووتا و تارمایی کەسەکانی تێکەڵ دەکرد و دەیکردن بەیەک تارمایی زەبەللاح کە بەدەیەها چاوی پڕ لە ترسەوە لە مەرگی من بڕوانێ، من مردبووم و ئاگام لە هەموو ترس و بێ ئۆقرەیی و دڵ داخورپان و ڕاچڵەکینێکی ئەوان هەبوو، لە دوای خامۆشی و متبوونی چەند سەعاتەم... هەر کە دەجووڵامەوە... دە کەس بەیەکەوە هاواری دەکرد:

«**ئەها جووڵایەوە... نەتاندی...؟**».

گوێم لە غەڵبەغەڵبێک دەبوو کە لە حەوشەکەوە دادەڕژایە سەر پێخەفەکەم، ئەو چەشنە غەڵبەغەڵبە مردووە بەتەنها لە ناشتنی کەسێکدا لە گۆڕستان گوێ بیستی دەبووم، لەوە دەچوو کەسانێک لێرە و لەوێ: لەبەر هەیوان، دەنێو گەنجینە و کادین و تەویلە و ناو حەوشە و ژوورەکانی دیکە و دیوەخانەکەی باوکمدا بۆ من بگرین، چەندە ئەوان غەمگینتر دەبوون، چەندە پتر دەگریان... من ئەوەندە زیاتر هەستم دەکرد ڕۆحی تۆراوی شیرین ئاشت دەکەمەوە، خوێنی ڕژاوی بزنە شێتەکەم بەسەر ئەو کەرتە شاخانە کۆ دەکەمەوە، لەتوکوتی گۆشتی پەرت و بڵاو و گیرساوەی بەسەر لق و پۆپی درەختەکانی قەدپاڵدا، بەموعجیزەیەک کە تەنها لە خەونەکانمدا دێتە دی دەیکەمەوە بەو بزنە هارەی خۆم، ویستم خۆم کێل کەمەوە، سەد دەست فریام کەوت، دە سەرین بەیەکەوە ئامادەبوون بخرێنە بەر پشتم، دایکە تا ئەو حەلە وەک پەیکەرێک لە قوڕ بەدیارمەوە دۆش دامابوو، فرمێسکی درشتی دەڕژایەوە ناو کۆتکە شیرەکە و لە دەمی من نزیکی دەخستەوە بەهەویای ئەوەی کە بیخۆمەوە گەرچی ساردیش بۆتەوە، هەستم





دەکرد ئێسقانەکانم لێکدی ترازاون، نەمدەوێرا بجووڵێم نەبا گۆشتی لەشم هەلا هەلا لێم هەڵبوەرێ، نە دەستەکانم هی خۆم بوون و نە پێیەکانم، هەر هەموو چاوەڕێ بوون کە قومێک لەو شیرە بخۆمەوە... کەللەیی بووم و نەمکرد، دوای تۆرانی شیرین و ونبوونی... دوای مەرگی بزنەکەم هەر دەبوو شەرەفمەندانە بمرم، ئیدی ڕسوایی و زەلیلی با بەس بێ، چەندە هەوڵم دا چاوەکانم بکەمەوە و ترسی ناو چاوی هەمووان بخوێنمەوە، کەچی پێڵووەکانم گران دادەکەوتن و کوێرایییم دادەهات، بۆ ئەوەی کەمەکێ هێزم بێتەوە بەر و زیندوو ببمەوە، ئەو بەیانییانەم دەخستەوە یادی خۆم کە شیرین لەبەر زۆپای گڕگرتوودا سەمای بۆ دەکردم، سەمایەکی کیژانە و پاک و جوان، کە ئەوەم بیرکەوتەوە دامە پڕمەی گریان و هەر هەموو حەشاماتی ژوورەکە بەگەورە و بچووکەوە ڕاچەنین و لەگەڵما کردیان بەشین و واوەیلا، وەیاد هاتنەوەی هەڵدێرانی بزنەکە و مەرگی ناوادەی وای کرد سەرم بەدەم هەنسکەوە هەڵبقەنرێت، دەستی ڕاستەم بەرز کردەوە بەو نیازەی بەدایکە بڵێم: ئەو شیرە ناخۆمەوە، من ئیدی تا دوا فرمێسک و هەنسک و هەناسە ژێر نابمەوە و دەمرم... کە چاوانم کردەوە جگە لە تاریکی ژوورەکە و هەناسەی تێکەڵی نەنکم و دایکم هیچی دیکەم نەبیست، شتێک لە دڵما، لە هەناومدا، لە ڕۆحمدا ڕادەتەکی و لەگەڵ خۆیدا ڕایتەکاندم، دانەچۆقەم پێ کەوتبوو، دەت وت خراومەتە ناو گۆلاوێک لە بەفراو، هێدی هێدی گوێم نەما، چاوم نەما، دەستێک لەناو قووڵایی تاریکییەوە، نەرم و نیان و زۆر بەمیهرەوە، هات و فرمێسکی قەتیسماوی هەردوو گۆشەی چاوانمی سڕی، وێ دەچوو زیندە خەون بێ، ئەوەیان دەستی شیرین بوو، بۆنی دەستی ئەوم دەناسییەوە، گەرمی خوێنی سەری پەنجەکانی، نا... ئەو دەستە نە هی دایکە بوو... نە هی نەنکە و نە هی خوشکەکانم، دەستێک کە بەسیحری سەری پەنجەکانی ڕۆحی وشک هەڵاتووی منی تەڕ و تازە دەکردەوە، سەری پەنجەکانی گەیاندە پێڵووەکانم و وەک دوو ئەستێرەی کز درەوشانەوە، ژوورەکەم ڕووناک بۆوە، بەچرپەوە بانگی دەکردم، ئەوەندە

نزیک کە هەناسەی گەرمی نەرمایی گوێی ڕاستەمی گەرم دادێنا، هەردوو چاوانی دڕی بەو تاریکییە دەدا کە دەمێک بوو ژوورەکەمی داگیر کردبوو زۆر باریک و بنێس ببوو... بەزۆر سەری پێ ڕاگیر دەکرا، لە من ڕادەما و دەگریا، لەژێر ئەو هەموو فرمێسک و تۆز و تەمەدا زەحمەت بوو کولْمە ئاڵەکانی ببینم، هەڵدەلەرزی، هەردوو دەستەکانیم لە دەمم نزیک خستەوە تا بەهالاوی هەناسەم گەرمیان کەمەوە... بەچرپەیەکەوە کە دواجار لە ڕۆحمدا خنکا پێی وتم:

«**فەرهاد... من ئیدی ناتبینمەوە!**».

کە وای وت لێم بزر بوو، لەوە دەچوو لە پشت سەرمەوە بێ، نەمدەتوانی ئاوڕ بدەمەوە یان خۆم وەربگێڕم و بیبینم، لەوە دەچوو شیرین-یش وەک من نەخۆش و ڕەنجاوبێ، لەوە دەچوو لەناو پێخەفی دەردەداری هاتبێتە دەرێ، بەدەم وڕێنەوە هاوارم دەکرد:

«**شیرین... هۆ شیرین... مەڕۆ تووخواکەی بەتەنیا جێم مەهێڵە...!**».

لێم دوور دەکەوتەوە و ژوورەکەم لێ بوو بەداروودەوەن و پڕ لە گاشەبەردی سەر لێواری خەرەندەکە، من ڕام دەکرد و شیرین خێراتر غاری دەدا... لە ناکاو گەیشتە سەر هەڵەمووتێک و کە ئاوڕی دایەوە لێم بوو بەبزنە شێت و پڕ بەئاسمانی سەر ئەو خەرەندە هاوارم دەکرد کە لەو هەڵدێرە نزیک نەبێتەوە، دەنا ڕەت دەبا و سەرانگرێ دەبێ و هەلاهەلا دەبێ و دەمرێ... لە چاوترووکانێکدا دیم هەڵدێرا و من لە هاواری خۆم وەئاگا هاتم و هەموو گیانم کەوتبووە سەر ئاو و ئارەقە، خودا هاوار... هێشتا بۆنی خۆشی شیرین ژوورەکەمی داگیر کردبوو... هەر دەت وت زیندەگی و هەوای پاکی شاخانی هێناوە و هێشتا نەڕۆیشتووە، لەوە دەچوو تارمایی و ڕۆحی ئەم هەر لە ژوورەکەمدا بووبێ، لەوەتەی نەخۆش کەوتبووم و دەمخواست بمرم... ئەو هەر لە ژوور سەرمەوە دەست لەسەر سینە وەستابووبێ... چەندین ڕۆژ و مانگ، هەستم دەکرد دەستی ئەو تارماییە هەر لەسەر تەوێڵم لانەچووبێت، دەترسام لابچێت و لەگەڵیا ڕۆحم دەربچێت، تارمایی سەلار





و سەنگین و میهرەبان بەڕازی دڵمی دەزانی و دەستی لانەدەبرد، نەمدەویست بجووڵێم، نەبا تارماییە جوانەکەم بتۆرێنم و ژوورەکەم بۆ مەرگ و نەخۆشی چۆڵ بکات، کتوپڕ پژمیم و ڕاچەنیم، کە چاوانم کردەوە، دیسانەوە، جگە لە تاریکی و هەناسەی تێکەڵی نەنکم و دایکە کە ببوو بەغەڵبەغەڵبێکی غەمگین هیچی دیکەم گوێ لێ نەبوو، لە بری دەستی پڕ لە میهر و سۆزی تارماییە خۆشەویستەکەم پەنجە لەرزۆکەکانی نەنکم وەک چڵ و چێوی وشک هەڵاتوو نیشتبوونە سەر تەوێڵم، کە لە ترسی هاوارەکەم بەپەلە چرای کوژاوەیان داگیرساندەوە دایکم بینی هەر پەیکەرەکەی جارانە و فرمێسکی بەردینی بەسەر ڕوومەتەوە و کۆتکێک شیر بەدەستییەوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنم دایکە زیندووە و بت ئاسا بێ گیان نییە، بۆ ئەوەی تارمایی شیرین لە نەنکم جیا بکەمەوە گەر ئەمجارەیان هاتەوە خەونم؛ دەبوو دوو سێ قوم لەو شیرە بخۆمەوە، کە دەستم بۆ کۆتکە شیرەکە برد لەگەڵ تکە فرمێسکەکان خەندەیەکی پان و نەخۆشانەی دایکە ڕژایە ناو شیرەکە و خواردمەوە، هەزار جار داوام لە بزنە شێت کرد و پاڕامەوە کە لێم ببوورێ، خواردنەوەی ئەو دوو سێ قومە شیرە لەلای من خیانەتێکی گەورەبوو، خۆ من دەمزانی، نە شیرین و نە بزنەکە نایانەوێ من خۆم بکوژم، دەمزانی گەر من بمرم کەس نابێ حەکایەتی هەردووکیان بۆ کەس بگێڕێتەوە، هێشتا تەڕایی ناولەپی شیرین بەسەر تەوێڵمەوە بوو، هێشتا قاڕینی پڕ ئازاری بزنە شێت هەر لە گوێمدا بوو، دەمویست بۆ دواجار نەمرم و زیندوو ببمەوە، هەناسەم بێتەوە بەر و زمانم گۆ بکا و بپرسم:

«**کوانێ شیرین؟!**».

پاش ئەو دوو سێ قومە شیرە هەموو شتێکم بیر کەوتەوە: دوا بەیانی لێکدابڕانی من و شیرین، هەڵواسینم بەدار هەنجیرەکەوە، هەڵدێرانی بزنەکە و گەڕانم بۆ لەتوکوتی گۆشت و خوێنی ڕژاوی بەسەر کەرتە شاخ و دەرختەکانەوە... کە ویستم هەواڵی لە دایکە و نەنێ بپرسم: پرسیارەکان،

چ لە ترسانابێ و چ لە شەرمان، لەسەر زارمدا دەمردن، دەت وت یەک ساڵە نەخەوتوون و چاوەڕێ بوون لەو کۆتکە شیرە بخۆمەوە و بنوون، جگە لە خۆم و خەونی هەڵبزرکاوم، جگە لە گرانەتا و وڕێنەکانم، جگە لە پرخەپرخی نەنێ و دوعاکانی بەر لە خەوتن و گریانی هەمیشە ئامادەی دایکە هیچی دیکەم نەدەبیست، دەگەڕام لەناو ڕووناکی زەردی چرای تازە هەڵایساو کە دووکەڵی دەکرد و ژوورەکەمی تاریکتر دەکرد و ڕۆشنایی خۆی دەکوشت، دەگەڕام بۆ ئەو دەستەی تۆزێک لەمەوبەر زیندووی کردمەوە و پاشان بەتەنیا جێی هێشتم، هەستم دەکرد پەتێک لە ملم ئاڵاوە، هەر کە خۆم دەجوولێنم پتر لە ملم شەتەک دەدرێ و دەمخنکێنێ، ناچار سست و مردوو، بێ جووڵە، لەو کەمە ڕۆشناییییەی چراکە ڕادەمام کە لەنێو دووکەڵدا لەگەڵ من دەمرد و دەخنکا... ڕەشتر دادەگەڕا، لەگەڵ هاوار و ناڵینی من لە ترسی خنکان دایکە و نەنکم، دیسانەوە، لە خەو ڕادەچەنین، بەهەڵەداوان دەهاتنە سەرینم، دەنێو تاریکیدا بۆنی هەردووکیانم لە یەکدی جیا دەکردەوە، دایکە دەچووە گژ چراکە و گڕ و دووکەڵەکەی لە یەکدی جیا دەکردەوە، بەپەلە پەنجەرەکەی دەکردەوە، بەو شەوە بای بۆنخۆشی شاخان ڕژایەوە سەر پێخەفەکەم و بۆنی تەویلەکەش سەرمەست و زیندووی کردمەوە... دایکە دەیپرسی چ خەونێکی ناخۆشم بینیوە و نەنێ دەی وت: حەزت لە چ شتێکە ڕۆڵە شیرینەکەم، بەدەست و پەنجەیەکی لەرزۆکەوە جامێک ئاوی بۆ ڕاگرتبووم... دایکە وازی نەدەهێنا و دەیپرسی:

**«خەونی ناخۆشت دی... بەقوربانت بم؟»** .

بۆ یەکەم جار دوای لاڵبوونی چەند شەو و ڕۆژم ویرام بپرسم:

**«دایکە شیرین... دەتوانم شیرین ببینم؟»** .

هەردووکیان بەوپەڕی سەرسامی و ترسەوە، ترس لە وەدی نەهێنانی داوای ڕۆڵەیەکی زۆر ئازیز کە دەیەوێ بەر لە مەرگ تەنها خۆزگەیەکی هەیە و بێتەدی... پرسیان:

**«ڕۆحە شیرینەکەم... بەم درەنگی شەوە؟»** .





بەڵگەرمی و سۆزی پیرە عاشقێکەوە، بەتاسە و خۆزگە و ئارەزووی سەد فەرهاد-ەوە وتم:

**«ئا... دایکە شیرین-م دەوێ... نەنێ... بەڕاست... شیرین ماوە؟»** .

دایکە سەد سوێندی خوارد و دەی وت:

**«سبەی... زوو... هەر کە ڕۆژ بۆوە... ڕۆڵە شیرینەکەم سبەی... سبەینێ... وەعدبێ... زێدە جەرگم»** .

نەنێ دڵی دەدامەوە:

**«خۆ شار بێ حاکم نییە... چما کچ کوشتن هەوەنتەیە؟»** .

لەسەر ئەو بەڵێنانە دەخەوتم و ڕادەچەنیم، دەخەوتم و خەونم دەدەی و ڕادەچەنیم... وەلێ خودا هاوار... هەرگیز نەبوو... نەکرا... نەیانویست، هەرگیز ڕۆژ نەبۆوە و من هیچ بەیانییەکی دیکەم نەدیییەوە و تا ئەبەد خۆر لە من ئاوابوو، هەر کە لە خەو ڕاچەنیم و لە شیرین-م دەپرسی هەر شەوبوو، دەت وت ژیانی من لە دوای مەرگی بزنە شێت و لێکدابڕانی ئەو بەیانییە لە شیرین یەک شەوی بێ کۆتایی بوو... هیچ سپێدەیەکی دیکەی بەدواوەدا نەهات...

ئیدی نەخۆشی و بۆنی مەرگ ترس و شەرمیان لە لای من نەهێشتبوو، هەر دەمپرسی و وازم نەدەهێنا، هەمیشە وەڵامی پچڕ پچڕ دەیترساندم:

**«- باوکی ناهێڵێ...**

**- لە مەکتەبە...**

**- ئەویش زۆر نەخۆشە...**

**- ماڵیان باری کرد...**

**- واز لە خەونی خەراپ بێنە و... بنوو...**

**- سبەی...**

**- با چاک بیتەوە...»**

من دەترسام... ئەو لە من ئازاتر بووبێ و مردبێ، ئیدی بڕیارم دا لە سێ

ژەم زیاتر بخۆم، شیر و هەنگوین و ژاژی و پەنیری سەرخوانی بەیانیان، نەوسنانە، بمالّمەوە، هەرچی میوەی دونیا هەیە بیخۆم... تا زووتره چاک ببمەوە و بەدوای شیریندا بگەڕێم...

یەکە یەکە هاوپۆلەکانم دەهاتن، شوانە بچکۆلەکان زەق زەق لێم ڕادەمان و هیچیان نەدەوت، دەت وت لەو ژوورەی کە من لێی کەوتووم و خەستەم پەنجەرەیەک هەیە و هەرگیز خۆر لەو دیوییەوە هەڵنایەت، دەت وت لە دوای دووکەڵکردنی چراکە، لەو شەوەدا، کە تارمایی شیرین ئاوەدانی کردەوە ژوورەکەم: من هەردوو چاوانم کوێر بوون بەدووکەڵ، کە سەیری دەفتەر و کتێبەکانم دەکرد پیتە ڕەشەکانی لەبەر چاوانم دەبوون بەمێروولە و تێکەڵ دەبوون، دەترسام ئەو کاتەی بیرم دەکردەوە نۆ جاران نۆ دەکا چەند؟ کەچی نەمدەزانی... شەش جاران شەش؟ دوو جاران دوو؟ هەر نەمدەزانی، نا... من هیچم بیر نەمابوو... هیچ... دەت وت مێشکم تەختە ڕەشەکەیە و بەتەختەسڕێک پاک کراوەتەوە و ئیدی کەس نەماوە هیچی لەسەر بنووسێ، ئەوەندە لە خۆم دەترسام... لە خەڵکی کە وای لێ هاتبوو وەک قالۆنچە لە گۆشەیەکی ژوورەکەمدا خۆم بشارمەوە، چیدیکە باوکم نەبینییەوە، نیوە شەوان لە شوێنێکەوە نا... بەڵکو لە دەیەها شوێنەوە: لە هەیوانەوە، لە ئاودەستخانەکەوە، لە هەموو ژوورەکانەوە، لە سەربانەوە، لە تەویلەکەوە... لە مزگەوتەوە دەکۆکی و قرخەقرخ بەڵغەمی ڕۆ دەکرد و شەیتانی بەنەفرەت دەکرد، من لەگەڵ هەر کۆکەیەکی ئەودا ڕادەچڵەکیم و زەندەقم دەچوو، کتوپڕ گوێم لە نەعرەتە و جنێوەکانی مامۆستا عوسمان دەبوو، ڕادەچەنیم و دەگریام و هەترەشم دەچوو، گوێم لە قاڕینی کوژراوی بزنەکەم دەبوو ئەو کاتەی سەری بەر تاشەبەردێک دەکەوێ و دەتەقێ، گوێم لە قیژە و هاواری لەناکاوی شیرین ئەو کاتەی باوکی هەر بەقژ تا سەر خەرەندەکە ڕای دەکێشێ و لەوێوە هەڵیداتە خوارێ... ئیدی تەواو... ژیانی من شەوانی مۆتەکە و بەدەم خەو ڕاچەنینەوە تەواو نەدەبوو، خۆم دەبینییەوە کە لە ناو شارێکی گەورە و زۆر قەڵەباڵغدا ون دەبووم و





دەرۆزەم دەکرد، یان شوانم و لە شەوێکدا دەیەها گورگ لە ڕانەمەڕەکەم دەدا و منی ڕەنج بابردوو لەو هەموو کەلاکی بزن و مەڕە ڕادەمێنم و هیچم پێ ناکرێ، ئەوەشی کە دەمێنێ و گورگ شپرزەی دەکا و دەتۆقێ و لە خەرەندەکەوە خۆ هەڵدەدێرێ، خۆم دەبینم فەرهاد-م و کێوی بێستوون کون دەکەم و لە بری تەقینەوەی کانییەکی سازگار لە شاخدا... لافاو هەڵدەستێ و ئاوایی بەژن و پیاو و پیر و منداڵەوە ڕادەماڵێ، بەمزگەوت و ماڵەکانەوە، بەتەویلەی پڕ لە مەڕ و بزنەوە لەناو ئاودا دەخنکێن، دواجار بەسەر شەپۆلەکانەوە تەرمی شیرین-م دەدی خنکاوە و قژی پەخشی بەقەد پانتایی ئاوایی سەر ئاو کەوتووە، لە پاش مەرگی ئەو خۆم دەبینی قوڵنگ فڕێ دەدەم و خۆ دەدەمە دەست لافاوەکە و دوور دەمبا و دوا کەس منم دەخنکێم، دەمویست بخۆم و بخۆمەوە تا چی زووتره زیندوو ببمەوە و بچمەوە سەر ئەو هەڵەمووتەی بزنەکەم، لەوێوە، هەڵدێرا، لە پەنجەرەی کراوەوە دەمڕوانی و هەمیشە تاریکی شەو سەرترۆپکی چیاکانی لێ دەشاردمەوە، ئەستێرەکانیش شەرمنانە دەسووتان، مانگ بۆ هەمیشە لەودیو هەورەکانەوە سەرەتاتکێی لەگەڵ دەکردم، لەوە دەچوو بەزگماک من ئیفلیج ببووم، لە حەژمەتانا دەگریام و فرمێسکەکان لە قوڕگما دەکولان، خەونم بەوەوە دەدی کە جارێکی تر بەکامی دڵ و بەهەوەسی خۆم بەسەر کەرتە شاخەکاندا بازبازێن بکەم، خەونم بەوەوە دەبینی بچمەوە مەکتەب و وەک جاران بەیانیانی زوو شیرین بێ و سەمایەکی کیژانەم بۆ بکا، دەمپرسی: تۆ بڵێی بۆم بکرێ کاریلەیەکی دیکە بەخێو بکەم و بەختم یاربێ وەک بزنە شێت هاروهاج بێ و لە ڕاستەڕێییەکان لابدا و گیای حەرام بخوا، بمباتەوە سەر هێلکەی ڕەنگاوڕەنگ و نێرگزەجاڕ و ئەشکەوتی نسرم و زنە و زەنوێر...

شەوەکان نەدەبڕانەوە، هێدی هێدی و بەزەحمەتێکی زۆرەوە هەردوو بن باڵیان دەگرتم و ڕاست دەبوومەوە، بەدارە دارە تا بەر پەنجەرەکە هەنگاوم دەنا و ماندوو دەبووم، بەوەی کە دایکم و نەنێ و خوشکەکانم و پوورەکانم

و هەندێ لە ژنانی دەرودراوسێ دەگـریان، هەسـتم دەکـرد من دووچاری دەردێکی گران بوویمە و لەوەدایە بمرم... جا بۆ نەمرم؟ کە من نە شوان و نە فەرهادی عاشق و نە شاعیر و نە پێغەمبەر بم... بۆ نەمرم؟!

لە بەیانییـەکی تاریک و ڕووندا، هێشتا تەم و دووکەڵ و تاریکی لێکدی هەڵاوێرد نەببوون وەئاگایان هێنام، حەمامیان بۆ داخستم؛ حەمامێکی زۆر گەرم کە چڵک و چەوری و عارەقەی چەندین شەو و ڕۆژم بشواتەوە، جلی تازەیان لەبەرکردم، هێدی هێدی کازیوەی دەدا، خۆر گرانتر لە من دەجووڵا و هیلاکتر لە من چاوانی هەڵدێنا، دوای ئەم هەموو شەو و تاریکییە یەکەم جار بوو هەتاو ببینم، لەوە دەچوو چاوەکانم لە دوای ئەو حەمامە گەرمە ڕۆشن بووبێتنەوە، لەودیو چیاکانەوە هەتاوێکی شەرمن دەڕژا و کووچە و کۆڵانەکانی ڕووناکتر دەکردەوە... بەر پەنجەرەی ژوورەکەم... یەکەمین بەیانی بوو گوێم لە باعەباعی مەڕ و قاڕینی بزنەکان بێ، دڵی پڕ قەهرم گەرمتر و بەگوڕتر لێی دەدا، یەکەم جار بوو کە بەبەردەم ئاوێنەکەدا ڕەت بووم، خۆم بینی کە چەندە لە عاشقێکی پیر و دۆڕاو و لاواز دەچووم، نەخۆش لە دووری شیرین، چەند لە شوانێکی مایە پووچ دەچووم کە هەر هەموو مێگەلەکەی هەڵدێرابێ... لە شەرتە شوانی دۆڕابێ...

دایکە زۆر زوو هەستابوو، تەنوورەکەی گڕدابوو، زوو زوو پەمپی لە پرێمزەکە دەدا، حەوشەکەی پڕ کردبوو لە سۆز و خەمخۆری و دوعای بەیانیان کە حەسارەکەمان بەپێوە بمێنێ، هاتە ناو دەرگاکە و لەسەر شانییەوە ڕۆشناییەک دەرژایە سەر پێخەفەکەم، لە نێوان هەردوو بەلەکییەوە پەرتبوونی هەتاوێکم دەدی، لەودیو شوورەی حەسارەکەوە کۆڵان لەگەڵ تێپەڕبوونی کەر و بار و عارەبانە و مێگەل پڕ ببوو لە هەرا و ئاوەدانی...

دڵم خۆش بوو کە ئیدی دوای ئەو هەموو شەوە درێژانە ڕۆژم لێ هەڵهات و شیرین دەبینمەوە... لە نەنکم داوا دەکرد:

**«نەنێ... با ئەم بەیانییە شیرین ببینم!»**.





دەت وت دیوار دەدوێنم، دەت وت ئیدی دوای ئەو حەمامە و هەڵسانە سەرپێیەم کەمەکێ زیندوو بوومەتەوە و نامرم، ئیدی لەوانەیە بەرگەی مەرگێکی دیکە و دڵشکان و لێکدابڕانێکی دیکە بگرم، بڕیارم دا گەر تا ئێوارە هەواڵی شیرین-م پێ نەگات بەسکەخشکێش بێ بچمە مەکتەب یان ماڵیان، گەر نەیانهێشت دیسانەوە مان لە خۆراک دەگرم، ئەمجارەیان هەر بەڕاستی خۆم دەکوژم، ئاخر دەبوو فەرهادێکی بەوەفا بم، عاشقێک لە عاشقە پاکەکانی ناو حەکایەتەکانی نەنکم...

چەندە تەنیا و غەمگین بووم، نەنێ چیدیکە حەکایەتی بۆ نەدەکردم... کە لێم پرسی:

**«نەنێ بۆ وەک جاران حەکایەتم بۆ ناگێڕیتەوە؟»**.

بەدەم گریانەوە وتی:

**«زێدە جەرگم... حەکایەتەکانی من بوون تۆیان نەخۆش خست!»**.

*کە پێم وت:*

**«نەنێ هەتا نەمردووم... با جارێکی تر حەکایەتی شیرین و فەرهاد-م بۆ بگێڕیتەوە؟»**.

*فرمێسک لە چاوەکانی دەکولا و دەی وت:*

**«جەرگەکەم وا مەڵێ... تۆ زۆر لەوە منداڵتری باس لە مەرگ بکەی!»**.

*بەهەناسەبڕکێوە پرسیم:*

**«ئەی تۆ نەت وت گەورە دەبیت و شیرین-ی خۆت دەدۆزیتەوە؟!»**.

*بەحەسرەتێکەوە دەی وت:*

**«هەروا دەبێ ڕۆڵە... هەروا دەبێ»**.

وەک ساتەوەختی گێڕانەوەی خەمی لێکدابڕانەکانی ناو حەکایەتەکان و کۆتایی هاتنیان بەمەرگ و کارەسات، هەردووکمان بەیەکەوە، دامانە پڕمەی گریان، بەترسی عاشقێکەوە کە هەتا هەتایە مەعشووقەکەی دۆڕاندبێ پرسیم:

**«نەنێ... شیرین چی لێ هات؟ بۆ لێ ناگەڕێن ببینم؟»**.

هاوارێک لە حەوشە و غەڵبەغەڵی دەیەها کەروبار و ئەسپ سوار، زرنگەی زەنگوڵە و تێکەڵبوونی بەهەیاهووی دەیەها ژن و پیاو و منداڵ ڕژانە بەردەرگای حەوشەکەمان و نەنکمیان لە من دزی، من و پرسیارە مردووەکەمی لە ژوورەکەدا بەتەنیا جێهێشت...

دوای تاوێک بانگیان کردمە سەر خوانێک کە پڕ بوو لە هێلکەی کوڵاو کە تازە لە قەپێلک پاک کرابوونەوە و هەڵمیان لێ هەڵدەستا، کۆتکەیەک دۆ، قاپێ شیر، زەیتوون، دۆشاوی شاتوو، هەنگوین، پەنیری قاشکراو کە بۆنی پێستەی حەیوانی لێ دەهات، باوکم بەتووڕەییەوە فەرمانی پێ کردم کە بەخێرهاتنی میوانەکان بکەم، گەورە و بچووک، تێی گەیاندم کە هەر هەموویان خاڵۆزا و ئامۆزا و پوورزای منن و لە گەرمیان گەڕاونەتەوە و دەچنەوە کوێستان.

هەموومان دامەزراین و باوکم لەسەرپەڕ دانیشتبوو، لە ژیانما وەها کەیفساز و پۆشتە و پەرداخ نەمدیبوو، لە هەموو ژیانمدا ئەو میوانانەم نەدیبوو، ژنەکان زۆر سپی و نەرم و نۆڵ، پیاوەکانیش ڕەشتاڵە و سووتاو، لەوە دەچوو کچە عازەبەکانیان لەگەڵ خوشکەکانم لە گەنجینەکەدا بەترس و شەرمەوە لە قریوەقریو نەکەون، چونکە بەئاستەم قریوەی خنکاویان دەگەیشتە گوێم، منداڵە چڵمن و چڵکنەکانیان، وەلێ کوڵم سوور و چاو پڕ باق و بریق لە منیان دەڕوانی، لاوازی و ڕەنگ زەردییەکەم زەبوون و خامۆشی کردبوون، لەوە دەچوو لێم بترسن، یان وەک منداڵی خانەخوێ شەرمم لێ بکەن، جاروبار بۆ ڕەواندنەوەی ترسی خۆیان پەنجەی شایەتمانەیان دەئاخنییە لووتیان و بەڕووی مندا زەردە دەیانی گرت و بەدەم خەندەیەکی خوارەوە دەخەنینەوە، چاوی ژنەکان گەورۆنە و خەواڵو و، پڕ میهر و سۆز و شەرم، کە ئاویان دەخواردەوە نەیان دەهێشت پیاوەکان بیانبینن، بەدزییەوە و لەژێر چارشێوەکانیانەوە پاروویان دەگلاند، بێ ئەوەی وەک پیاو بملّچێنن، چاوی پیاوەکان بەغەزەب و ڕقێکی زۆرەوە دەبریسکانەوە، هەر بەو چاوە سوور و پڕ لە داخ و کینەی پیاوەکانەوە زانیم





کە ئەوانە هەر دەبێ خزمی نزیکی باوکم بن، باسیان لە ڕاو و کوشتن و لەوەڕگای کوێستان وساڵی گورگان دەکرد، لەوە دەچوو کۆمەڵێ شوان بن، بەڵام ئەوانیش وەک سیامەندی ئامۆزام مەحاڵە بەعاشق یان شایەر بن، لە چڕی ئەبرۆی پەیوەستی پیاوەکان دەترسام، لە سمێڵی تۆپڵی و پڕیان کە دەم و لێویانی لە من دەشاردەوە، بۆنی ژنەکان: تێکەڵ لە بۆدڕنی بزنەکەی من و بۆنی ژاژی و پەنیر نەخۆشییەکەی خۆمیان بیر دەبردمەوە، پشتێن ئەستوور و بەرباخەڵ شۆڕ، ئەو ژنانە ئەوەندە سەلار و سەنگین بوون کە پڕ بەدڵ حەزم دەکرد بەدایک و خوشک و پوورەکانم بن، قاوەڵتییەکە زۆری خایاند، هێدی هێدی پیاوەکان خامۆش بوون، ژنەکانیش خامۆشتر، باوکم بێ ئاگا لە خۆی بەقەهرێکەوە تەزبێحەکەی هەڵدەگلۆفی، دایکە دەگریا و نەنکم سەرگەرمی کۆکردنەوەی جلەکانی من و خۆی بوو، هەر هەموویانی لە بوخچەیەک ئاخنی، دایکە بەدەم لشمەلشمەوە چەند پارچە جلێکی دیکەی منی لە دەلاقەکەوە دەرهانی و قەدی دەکردن و ئەمیش نەنکم ئاسا هەمووی ئاخنییە ناو بوخچەیەکی بچووکتر و پێچایەوە، ئیدی من زانیم کە ئەو میوانانە بەتەنها بۆ ئەوە نەهاتوون ڕاگوزاری تێپەڕن، بەڵکو لەوە دەچوو سەفەرێکی درێژ بەمن بکەن، هەڵگرتنی قاپ و قاچاغ و پیاڵە و کتڵی و قۆری و کۆکردنەوەی وردە نان و لابردنی سەماوەرەکە زۆری خایاند، پێچانەوەی خوانەکەش زۆرتر، من لەوە نەخۆشتر و ماندووتر بووم بپرسم: چیم لێ دەکەن، نەنکم زوو زوو بە ژنەکانی دەوت: لێرە داوودەرمان نەما... حەکیم نەما... چاک و پیر نەما... هەر دەڵێی جنۆکە دەستیان لێ وەشاندووە، بەوەی کە هەر هەموو برا و خوشکەکانم کۆ ببوونەوە، هەر هەموو پوورەکانم، ژنانی دەرودراوسێ... زانیم کە ئیدی منی خەستە دەبەنە لای حەکیمێک کە نازانم لە کوێیە، باوکم هەر لە دوورەوە وەستابوو، پێی شەرم بوو سەیرم بکا، پێی شەرم بوو کە من لە پشتی ئەو هاتوومەتە خوارێ، چونکە سەدەها جار گوێم لێ ببوو... «حەیف کە لە من بووە»... ئەو بەیانییە گوێم لێ بوو بەچرپەوە بەخزمەکانی خۆی دەوت:

**«بیبەن... بەکەڵکی هیچ نایە!»**.

خوشک و براکانم زەلیل و غەمگینانە لە من ڕادەمان، ئەوەندە شەرممان لە یەکدی دەکرد کە مەحاڵ بوو یەکدی ماچ بکەین، جارێکیان کە هێشتا زۆریش ساغ بووم خوشکە گەورەکەم بەسۆزێکەوە ماچی کردم، من لە حەیبەتانا دامە پڕمەی گریان و درەنگ ژێر بوومەوە... بۆ؟ نازانم، دایکە وێرای لە باوەشێم بکا و بەسەرمدا بنووشتێتەوە و تێر بگری، باوکم لە دوورەوە کۆکی، دایکە لە ترسانا لە گریان ژێر بۆوە و لە باوەشی خۆی دەری کردم، ڕووەو دەرگای حەسارەکە بردمی، بەدەم ڕێوە عاشقانە و بەپەلە وەک دوا یادگاری ئەو حەوشە و ماڵە گوڵێکی سوورم لە گوڵەباخە تەڕ و گەشاوەکەی ئەو بەرەبەیانییە کردەوە، گوڵێک کە هێشتا عومری خونچەیەک بەری نەدابێ، هەر کە گەیشتمە ناو دەروازەکە بینیم پیاوێکی کەڵەگەت ڕەشتاڵە یارمەتی نەنکمی دەدا کە سواری پشتی هێسترە چەمووشەکە بێ کە نەیدەهێشت نەنکم خۆی ڕاگیر بکا و هەر جارێک و بەلایەکدا دەکەوت، هێسترێک کە هەر هەموو سەر و گوێلاکی، بگرە سەر کەفەڵیشی لەژێر دەیەها گوڵێنگەی زەرد و سووردا غەرق ببوو، هەمان زەلام وەک بوخچەیەکی زۆر سووک بم هەردوو دەستی خستە بن باڵەکانم، سووکێ بەرزی کردمەوە و خستمییە ناو ئامێزی نەنکم، بەترسی گرتنەوەی گۆزەیەک نەبا بشکێ منی گرتەوە و هەردوو چنگی چەنگاڵ ئاسای لە من گیر کرد و توند بەرزەفتی کردم، کابرای ڕەشتاڵە شەپێکی پانی لە کەفەڵی هێسترەکە دا تا لە کاروان دوا نەکەوێ، شەپێکی وا توند کە کڵاو و جامانەی لەگەڵ خواربێ، نەنکم هەر زوو هەردوو باسکی تێوە ئاڵاندم، منی خستە ناو هەناوی خۆی، کە زانی مات و مەلوول و لە باوەشیدا هەڵدەلەرزم و بۆ ئەوەی ترسم بڕەوێتەوە دوو سێ جاران بەدەنگێکی نووساوەوە کە هەستم بەزرنگەی خەم دەکرد تیایدا وتی:

**«ڕۆڵە شیرینەکەم خەم مەخۆ... یەک دوو مانگ لەو کوێستانە خۆشە لای خزمان دەبین... پاشان کە زستان هات دەچینەوە شار...»**.





لەوە دەچوو سەرم گێژ بخوا و ببوورێمەوە، گەر لەناو هەناوی قوپاوی نەنێدا بەند نەبوومایە لەسەر هێسترەکە دەکەوتمە خوارێ و بێ شک پەراسووەکانم لەژێر سمی هێسترەکەدا دەشکان، دەنێو هەرا و هۆریای خزماندا کە دەیانویست دڵنیابن کە کەس لە کاروان جێ نەماوە... گوێم لە نەنێ بوو دەی وت:

**«تا وەک گوێزی ساغت لێ نەیەیت نایەینەوە، قەولە لەوێ باشترین حەکیم بتبینێ»**.

بێ باک لەو بەڵێنە... من لە خەمی ئەوەدا بووم گوڵەکەم لەناو چنگما نەپروێ، ئان و سات هاوپۆلەکانم لە هەموو لایەکەوە بانگیان دەکردم، بەدەم بای غار و بەگورگەلۆقە ڕووەو مەکتەب کۆڵانەکەیان پڕ کردبوو لە هەرا و قاووقیژ، هەتاوی زیوین بەشەرمەوە دادەڕژا و خۆی لە دیوارەکان هەڵدەسوو، ئەو کاتەبوو کە چۆلەکەکان لە سەربان و درەختەکان و دیوارەکان و دار عەلەتریکەکان نەدەسرەوتن، هەوایان بەسەر سەرمەوە شەق دەکرد و فڕکەفڕکی باڵیان و تەقەتەقی ناڵی هێسترەکە کە بەر بەردەکان دەکەوت تەواوێک غەمگینی دەکردم، نەنکیشم بۆ ئەوەی بەدرۆ دڵخۆشم بکا و لەو بێدەنگییە دەرم بێنێ... دەمی لە گوێم نزیک خستەوە و وتی:

**«لە کوێستان تا هاوین دەڕوا دەتوانی بیبیتەوە بەشوان... کە چووینە شاریش مەکتەبەکەت تەواوکە... باوکت لەوێ کۆشکێکی کڕیوە... دەڵێن نە بکەی... نە بخۆی هەر تەماشای بکەی!»**.

دەمویست لێی بپرسم ئاخۆ دێینەوە ئێرە یان نا... بەڵام دیسانەوە قوڕگم گیرا و فرمێسک لە چاوانما دەکولا... زوو زووش نەنێ دەیپرسی:

**«گوێت لێیە... کوڕەکەم... ها... گوێت لێیە؟»**.

من لەوە مردووتر بووم گوێم لێ بێ، بەدەم ڕێوە لەناو تەپوتۆزی کارواندا نقوم دەبووین و نەنێ هەر قسەی دەکرد و نەیدەبڕییەوە، گوایە لەوێ هەموو شەوێک حەکایەتم بۆ دەگێڕێتەوە، حەکایەتی تازە کە من لە ژیانما گوێم لی نەبووە، هەر زوو چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، لە لووتمەوە دادەڕژایە ناو

قورگم و هەستم بەسوێری فرمێسکەکان دەکرد، لە دواجاردا و لە دوورەوە تارمایی باوکم و دایکم و خوشک و براکانم لێ تێکەڵ بوون کە بەشەرمەوە دەستیان هەڵدەبڕی، تا لە یەکدی وێڵ بووین بەحەسرەتەوە هەر ئاوڕم لێ دەدانەوە، وام هەست کرد من ڕووەو گۆڕستان دەبەن تا بمنێژن نەک ڕووەو کوێستان و حەکیمی لێزان. نەنکم توندتر هەردوو باسکی زۆر لاوازی تێ وەرێنام، منی بەسینگییەوە قرساندبوو تا بەر نەبمەوە، من وەک لاشەیەکی بێ گیان دەلەنگیمەوە، نەنێ بەزەحمەتێکەوە دەیویست لەناو باوەشی سارد و سڕی خۆیدا بەندم بکا، نەک هەر ئەوە... وازم زەن دەکرد دەیەوێ بمخاتەوە ناو هەناوی خۆی، بەهەر چوارلادا ئاوڕم دەدایەوە... ئەوە خوایە لەناو کوڕ و کچەکانی گەڕەکدا، هەر بەرێکەوت، لەو بەرە بەیانی سەفەر و مردنەدا (شیرین) ببینم، من بۆ بۆن و ڕەنگ و دەنگی ئەو دەگەڕام، دەمویست هەتا زووە لە گریان ژێر ببمەوە و بەرچاوانم ڕوون ببێتەوە، تا ئەو حەلەی دەگەمە بەردەمی خانووەکەیان، بەڵکو ئەو خوایە لەژێر سێبەری چڕی شاتووەکەدا لە ناکاو دەربکەوێ و من ببینێ کە نەخۆش و غەمگین بۆ دواجار بەهەردوو چاوانم، بەهەردوو دەست، بەڕۆحی کڵۆڵ و بریندار و دڵی سیسم سڵاوی ماڵئاوایی لێ بکەم و گوڵەکەی بۆ هەڵبدەم، من لەو ستوونی نوورە دەگەڕام کە لەبەردەم دەرگای دارینی نەخشەدار بەوێنەی دوو تاوس بەدەوری خۆیدا گەردەلوولێکی ڕەنگین دروست دەکات، هێزم نەبوو دەنا خۆم لە باوەشی نەنکم ڕادەپسکاند و لە دەست ئەو کاروانە دڵڕەقە خۆم قورتار دەکرد، خۆم لەناو ڕەز و باخەکاندا دەشاردەوە، لەناو ئەشکەوت و ژێر کەپکەشاخی بن کۆڵدا، لەنێو لق و پۆپی پیرە درەختێکدا؛ تا شیرین-م نەبینیایە نەدەڕۆیشتم، باریک و بنێس پرزەم لێ بڕابوو دەنا لە هێسترەکە خۆم دەخستە خوارێ و تا سەر خەرەندەکە غارم دەدا و لەو شوێنەی کە بزنەکەم هەڵدێرا... منیش خۆم هەڵدەدا، بەڵام نا... هەتا گەر دوا دیتن و دوا دڵنیایی من بێ لەوەی شیرین ماوە و دەیبینم؛ دەبوو هەر چاوەڕێ بکەم و ئەو گوڵەی ماڵئاوایی بۆ هەڵبدەم، ئەو گوڵەی لە بەیانییەوە هەناسەی





پیسی نەخۆشێکی وەک من هەڵدەمژێ و کەچی نایەوێ ژاکاو و سیس بێ، گوڵەکەم لەوە نەبەزتر بوو بمرێ، هێشتا بۆن و بەرامەی بەیانی لێ خۆش دەهات و ڕەنگ و بۆی بەمن دەبەخشی، هەر دەگەڕام و چاوانم دەگێڕا کە ئەو تارماییییە پاک و ڕۆشنە لەناو منداڵەکان وەدیار بکەوێ و بمبینێ، هاوپۆلەکانم هەر بەدوامەوە بوون، ئەوەندە نزیک ببوونەوە دەترسام هێستری چەمووش بەلووشکەیەک دەم و ددانی یەکێکیان بهاڕێ، ئەگەر ئەو زاقوزریقە نەبووایە وام مەزەندە دەکرد کە تەرمی من بەڕێ دەکەن، تاوێک هار و تاوێک خامۆش دەبوون، لەوە دەچوو هەندێکیان بەدەم زرمەزلێ و قەهرەوە بڵێن: خۆزگەمان بەخۆت... چش لە نەخۆشی و دەرد... خۆ قورتارت بوو لە مەکتەب! وام هەست دەکرد بڵێن:

**«لەیادمان مەکە»**

**«هەموو لە خەمتداین»**

**«کە چاک بوویتەوە... وەرەوە!»**

**«بۆ کوێ دەڕۆی؟»**

**«چەندە نەخۆش و هیلاکیت»**

خۆ جارجاریش هەڵبەز و دابەزی دوور بەدووریان لە مەزاق و گاڵتەپێکردن دەچوو... گاڵتە بەمن... بەشوانێکی دۆڕاو کە نەبوو بەعاشق... نەبوو بەشاعیر، بەمنێک کە بەتەنها لە ڕەسم و وەرزش دەرچووبووم، ئەو قوتابییە تەمبەڵەی هەرگیز سرودووەکانی پێ لەبەر نەدەکرا و دوو ڕۆژ و فاتیحاکەی بیر دەچۆوە، تا دەهات کۆڵان پڕ دەبوو لە پیاوی بەپەلە و خەواڵوو... ڕاکردوو بەدوای کەروباردا، چەندین ژنی دامەن شۆڕ تەشک و تیرێژی کراس و کەواکانیان لە زەوییەکە دەخشی و تەنکە تۆزێکیان لێ جێ دەما، من خەیاڵم هەر لەوەدا بوو بگەمە بەر دەرگاکەی ماڵی شیرین و بەیادی هێنانی گوڵە کێوییەکان لەو بەیانییانەی کە چاوەڕێی دەکردم لە مەکتەب ئەم گوڵە هەتیوو ماندووەی بۆ فڕێ بدەم، تا دەهات لە شاتووەکەیان نزیک دەبوومەوە، دەرگای کلۆم دراویان تاساندمی، لەسەر

پشتی هێسترەکەوە تا بۆم کرا سەرم هەڵبڕی و سەیری ناو حەوشە و سەربانەکەیانم کرد، کە گەیشتینە ئاستی خانووەکەیان دوو سێ جار و لەسەر یەکدی و زۆر بەتوندی بەپێی ڕاستەم، لە تەنیشتەوە، لە ورگی هێسترەکەم دەدا، لاقەکانم کورتتر بوون لەوەی بگەنەوە بن سکی، بێ ئاگا لە خۆم لە قەبرغەی هێسترەکەم دەدا و چەواشە دەبوو، ئەوەندە غەمگین و تووڕە بووم دەمویست پەراسووەکانی بشکێنم... دەمویست هەتا زووە و لە تخووبی ماڵی شیرین تێنەپەڕیوین لە دەرگا و دیواری حەوشەکەیان نزیکتر ببمەوە، نەنکم پەرێشان و شپرزە جڵەوی هێسترەکەی توند دەکردەوە تا بێتەوە سەر ڕاستەڕێ و خۆی لە دیوارەکە نەخشێنێ، من بەپاژنەپێ وەک شێت و هار، دڵڕەقانە، لە قەبرغەی هێسترەکەم دەدا و هەستم بەوە دەکرد کە گۆشتی تورتی لەژێر هەردوو گۆزینگمدا دەلەرزی و دەم دەمیش ماسوولکەکانی ڕادەتەکین، ئەوەندە لە دیواری پێشەوەی خانووەکە نزیک بۆوە کە من دەمتوانی زۆر بەئاسانی ناو حەوشەکە ببینم، بەپەلە گوڵەکەم گواستەوە دەستی چەپم تا چی زووە دەستی ڕاستەم لە دیوارەکە بخشێنم وەک نەنکم ئەو وەختەی کە بەهەردوو دەستی خۆڵی سەر گۆڕی پیاوچاکێک دەماشێتەوە، خۆڵێک لە ناولەپی ئارەقاویمدا دەخوسا و وشک دەبۆوە، خۆڵێک تێکەڵ بەبۆنی جێماوی گوڵەکەی ناولەپم، چاوەکانم دەگێڕا... چاوەکانم لەناو حەوشەکەدا، لە سەربانەکەدا بەجێ مان، بەسەر دەرگاکەوە، لەسەر شاپەڕە گرنج گرنجەکانی باڵی کشاوی هەردوو تاوسەکەی سەر دەرگا، نەخێر... هیچ هەست و خوستێکی ئادەمییانە لەو ناوە نەبوو... نەمدی... نەمبیست... هیچ جووڵە و هەناسە و دەنگێک، هیچ پارچە جلێک بەسەر تەنافەکەوە بەدەم باوە نەدەشنایەوە، کوپەی ئاوەکەش لە جێی جارانی نەمابوو، لە کپی و خامۆشی ناو حەوشەکە دڵم خاو بۆوە، چەند گەلایەکم لە شاتووەکە پچڕی و خستمە بەرباخەڵم، لە تاریکی بن هەیوانەکە ڕامام کە هەتاوی بەیانی نەیتوانیبوو و ڕاوی بنێ، لەگەڵ خشەخشی سۆلێک و بەدوایدا تاقوتریقی قاپقاپێک وە ئاگا هاتمەوە، لە





کوێوە دەهات؟ نەمدەزانی، خشەخشی کراسێک هاتە بەرگوێم، لەو خشەخشە و ورشەیە دەچوو کە لەو چەند بەیانیانەدا بەدەم سەمای شیرین-ەوە لە دەوری زۆپاکەدا گوێ بیستی دەبووم، پتر لە ورشەی ناسکی فڕینی مەلێک دەچوو کە هێشتا لەسەر خاکە و باڵ لێک دەدا و لەبن پێتەوە دەفڕێ، یان لە شنەشنی گەڵاکانی شاتووەکە بچێ ئەو وەختەی بگری بۆ ئەوەی کە ئیدی من و شیرینەکەم تا ئەبەد لە یەکدی دادەبڕێین و لە ژێر ئەو درەختەدا چیدیکە جۆلانێ ناکەین، لە داخانا و بێ ئاگا لە خۆم گوڵەکەی ناو چنگی چەپم هەڵدەگلۆفی و دەمپرواند، هەر زوو دەستی گرژم کردەوە و لێ گەڕام گوڵەکەم هەناسەیەک بدا و ترسام پەڕەکانی هەڵبوەرین... دەبوو نەهێڵم بژاکێ... ئەوە خوایە شیرین دەربکەوێ، دەستێک بەرز بکەمەوە و ماڵئاوایی لێ بکەم و گوڵەکەی بۆ هەڵبدەم، زەردەخەنەیەکی درۆ بخەمە سەرلێوانم و بیژبیانە چاوێک دابگرم و یانێ ها مەترسە... دێمەوە... نەنکم دەیزانی من (فەرهاد)ی ناو حەکایەتەکانی ئەو نیم، بەڵام خۆ دەشیزانی چەندە وەڕس و بێزارم... چەندە شپرزە و ماندووی ناو ئەم سەفەرەم، هەستی کرد لەژێر سێبەری چڕی شاتووەکە چۆن بەپەلەپەل دڵم لێ دەدا و حەجمانم لەبەر بڕاوە، بەمیهرێکەوە هەردوو باڵی کردبۆوە تا ئازادانەتر لەناو باوەشیدا شنەشن بکەم و بجووڵێم، گوێم لە هەناسەی پیر و خاوی نەنکم بوو، لە قرخەقرخی سینەی بەتاڵی، لە لەرزەلەرزینی سەری کە جار ناجار دەکەوت و چەناگەی ڕەقی وەک نووکە بەردێکی تیژ لە تەپڵی سەرم دەچەقی، لە خیزەخیزێک کە لە قورتی داقوپاوی هەردوو مەمکە چرچەکانییەوە دەهات و دەیترساندم، ترسی ئەوەی لەو کوێستانە دوورە بمرێ و تەنیا جێم بێڵێ: من و خەیاڵی دۆڕاوی شیرین بەجێ بێڵێ، بمرێ و یەکێک لە حەکایەتە کۆنەکانی تەواو نەکا و من لە ناو ترسی خۆم و کورتەباڵا و شەموولەکانی ناو چیرۆکەکەی بەجێ بێڵێ، لەو دووریانەی کە کورە کەچەڵ تیا ماوە و ڕاماوە: نازانێ ئاخۆ کام ڕێگەیان هەڵبژێرێ، لەو شوێنە جێم بێڵێ کە فەرهاد چەندین شەو و ڕۆژی پڕ لە ئارەقە و خوێنی

ماوە کێوی بێستوون کون بکات و کانیاوێک لەو بەردە ڕەقە بتەقێنێتەوە... وەک ئەوەی هەست بەو ترسەم بکا چرپەی خنکاو و نووزەی لاوازی ڕژایە ڕۆحمەوە:

**«مەترسێ ڕۆڵە شیرینەکەم... نەنکت خوا نایکوژێ تا لە شاییەکەتا هەڵنەپەڕێ!»** .

نووزەی پڕ میهر و مردووی نەنێ ئەو ترسەی ناو دڵمی لەناو نەدەبرد، نیگەران بەدەم لێوە لەرزەوە، دەگریام، بیرم لەوە دەکردەوە چەندە دڵڕەق بوون دایکە و باوکە و برا و خوشکەکانم، خاڵ و مام و پوورەکانم، هەرهەموو ئامۆزا و خاڵۆزاکانم... چۆن دڵیان هات من و پیرەژنێکی زۆر کەنەفت، سەر لەرزیو لە گوێی گۆڕدا، بێ بەزەییانە بدەنە دەست کاروانێک کە جگە لە تۆز و خۆڵ لە دوای خۆیەوە هیچی دیکە جێ ناهێڵێ، تۆز و خۆڵێک کە من و نەنکم هەڵماندەمژی، لە بەیانییەکی وا زوودا کە بەتەنها لەناو حەکایەتەکان یان لە خەونەکاندا وا دەستوبرد و لەناکاودا هەر هەموو شتەکان دەست پێ دەکەن و هەرواش کۆتاییان دێ، نازانم بۆچی لەو ئانوساتەدا پەلاماری شێتانەی گورگێکی بۆرم بیر کەوتەوە کە بەمناڵی دیبووم لە ڕانەمەڕەکەمانی دا و زەندەقی بەرخێکی ڕژاند کە بێ ئاگا لە خۆی لەبەر گوانی دایکیدا هەر چوارپەلی شکا و... کەوت و... مرد، یەکەم جارم بوو بەزیندوێتی چاوان گورگێک ببینم کە تەنها بینینی بەرخ بکوژێ... هەرگیز... لە یادم ناچێ... باوکم بەو شەوە بێ ئەوەی بزانێ گورگەکە لە کوێوە هەڵمەتی هێنا و لە کوێوە دەرباز بوو بەپەلە ساچمەزەنەکەی سوار کرد و تەقەی لە داروبەرد دەکرد، تەقینەوەی ساچمەکان کە بەر بەردەکان دەکەوت پزیسک و ڕژانی برووسکە و گڕێکی عومرکورتی لەو دەوروبەرەدا بڵاو دەکردەوە، سەدای تەقینەوەی ساچمەکان دەنێو خەرەندەکەدا و لەناو شاخان و ئاسماندا دەنگی دەدایەوە، ئەو هەرا و سەدایە وای کرد مەڕەکان بتۆقن و گێژ و وێژ بەناو یەکدیدا بێن و بچن و ئۆقرە نەگرن، ئەو سەدا و شەقژنی ساچمە لە هەوادا مەلەکانی لە هێلانەکان





تەراند، مار و مێرووی لە کونان وەجووڵە خست، شپرزەبوونی هەواش گەڵای درەختەکانی خستە سەر لەرزین، کە بەپرتاو چوونە سەر بەرخەکە... دایکەکەی بەقەهرێکی زۆرەوە دەیلستەوە و دەیباعاند... من دەمزانی ئەوەیان «باعەباعی ناو ڕانی ساز و سەنتوور و زیل» نییە... لەوە دەچوو بگری، دایکی من بەقەد ئەو مەڕە منی نەلستەوە، باوکم بۆ مەرگی بەرخەکەی گریا، کەچی بۆ نەخۆشی و سەفەری من نەگریا، دوای ئەو شەوە شوومە بوو کە لە ناوەڕاستی حەکایەتەکان نەنکم هەراسان دەکرد و دەمپرسی:

**«نەنێ گیان... بۆچی دەبێ گورگ مەڕ بخوات؟»** .

هەر هەمان وەڵامی ئامادەی پێ بوو کە هەرگیز من دڵم بەو وەڵامە خۆش نەدەبوو... ئەوەندەی تر تووڕە و بێ ئۆقرەتری دەکردم:

**«زێدە جەرگم شێر و پڵنگ ئاسک دەخۆن، گورگ مەڕ دەخوا و مەڕیش گیا دەخوا»** .

وازم نەدەهێنا و دەمپرسی:

**«بۆچی وایە نەنێ؟»** .

دەستەپاچە و بێ چارە و ماندوو و بەوەڵامێکی دروست، دروست لە نەزەر خۆی، دەیویست لە پرسیارەکانم ڕابکا و قورتاری بێ:

**«کوڕەکەم خودا کەڵبە و جڕنوکی بەشێر و پڵنگ و گورگ بەخشیوە...!»** .

مەحاڵ بوو دڵم ئاو بخواتەوە و نینۆکەکانی خۆم دەکرۆشت و تەنگەتاوتر لە هەموو کاتێک زۆرتر دەمپرسی:

**«ئەی بۆچی کەڵبە و جڕنوکی نەدا بەمەڕ؟»** .

شپرزە و بەپەلە دەیویست بگەڕێتەوە لای پاڵەوانەکەی و حەکایەتەکەم بۆ تەواو بکات... من نەمدەهێشت:

**«نەنێ گیان... بەرخ و مەڕ و بزن کە ئەوەندە گوناه بن و بخورێن... دەچنە بەهەشت یان جەهەننەم؟»** .

ئیدی تەواو بەندی تەحەمولی دەپچڕا و دەستی بەیەکدا دەدا و سوێندی

دەخوارد کە ئەگەر واز نەهێنم دەچێ دەنوێ و ئەوەشیان دوا حەکایەتی دەبێ کە بۆ منی بگێڕێتەوە... ئیدی مانی دەگرت و نقەی نەدەکرد... لەبەردەم ترسی نەنێ لە خودا و لە پرسیارە سەرەخۆرەکانی خۆمدا منیش مات و مەلوول دادەنیشتم، کە دەیزانی لەبەردەم دۆشدامانی ئەودا منیش خامۆش و وەڕسم دەهاتە دەنگ و سوێندی دەدام کە ئیتر واز لەو جۆرە پرسیارانە بێنم و پێی دەوتم:

**«مەهێڵە شەیتان بچێتە دڵتەوە... خوا خۆی حەکیمە و دەزانێ بۆ گورگ مەڕ دەخوا و مەڕیش گیا...»**.

شەوەهای شەو هەراسانیم دەکرد و ئیدی شەوانی من و نەنێ پڕ ببوو لە شەڕ و ئاشتی و پرسیار و گومان و حەکایەتە غەمگینەکان، بێ ئاگا لە خۆم لە باوەشی نەنێدا هەڵدەلەرزیم و بەدرێژایی ئەو کۆڵانە و ڕێگاکە دوو چاوی سوور و پڕ خوێنی ئەو گورگە لە پێشمەوە بوون، دەیویست پەلاماری هێسترەکە بدا، هەمیشە گورگ پەلاماری ئەو مەڕە دەدا کە کەوتۆتە دواوەی هەموو مەڕ و بزنەکان، من و نەنکیشم لەو کاروانەدا دوا کەس بووین کە لەسەر هێسترەکە دەلەنگینەوە... دەترسام شەو دابێ و هەر بەڕێگەوە بین... لە ناکاو لێم پرسی:

**«نەنێ... کەی دەگەینە کوێستان؟»**.

پێی سەیر بوو گوێی لە دەنگم بوو... لە خۆشیانا وتی:

**«دوو شەوی تر!»**.

ئیدی تەواو... من هەترەشم چوو... هەموو شتێک... هەر بەلا و کارەساتێک لەناو تاریکی شەو و ئەو شاخ و داخانەدا سەیر نابێ گەر بقەومێ، ئەوەندەی تر زەندەقم ڕژا کە هێدی هێدی ورشەورشی کراس و گەلا و فرکەفرکی شیرینی باڵی مەلان لە گوێمدا نەدەما، تا پتر لە ماڵی شیرین دوور دەکەوتمەوە گوێم لە لوورەلووری گورگان دەبوو کە لە هەزار لاوە هەراسانی دەکردم، دوو چاوی خوێنینی گورگ وان لە پێشمەوە و تارمایی ڕۆشنی شیرین-یش لە دوامەوە هەر دەرنەکەوت، دەمویست سەرم لە نێوان





هەردوو مەمکی چرچەوەبووی نەنکمدا نقوم بکەم و هەردوو پەڕەی گوێم دابخەن و گوێم لە هیچ نەبێ، دەت وت کەللەی سەرم ئەشکەوتێکە و لوورەی گورگێک تیایدا دەنگ دەداتەوە، لە ترسانا پتر خۆم ئاخنییەوە ناو باوەشی، سست و مت بووم و هەناسەم لە سینەمدا خنکاندبوو، ئەوەندە بێ جووڵە و سست کە نەنکم بترسێ و ڕامتەکێنێ و دڵنیابێ کە ماوم و هەناسە دەدەم... چرپاندی:

**«هەنسک هەڵمەدە هەموو کەسەکەم... چاک دەبیتەوە و بەیەکەوە دەگەڕێینەوە ئێرە!»**.

سەیری گوڵە ژاکاوەکەی ناو دەستی خۆم دەکرد و دەگریام، هەموو جار پێم دەوت:

**«گوڵەکە بەماچێک»**.

بێ شەرمانە ڕوومەتی لای ڕاستەی لە دەمم نزیک دەخستەوە، مەکربازانە دەی وت:

**«دە زوو... دە زوو...!»**.

نەمدەوێرا... گەر کەسیش دیار نەبووایە هەر نەمدەوێرا... گوڵەکەم بێ ماچ دەبەخشی، من هەرگیز شیرین-م ماچ نەکرد... چونکە دایکم هەمیشە سەد بارەی دەکردەوە کە هەموو کچانی گەڕەک خوشکمن و... ماچیان لە من حەرامە...

هەنسکم هەڵدەدا... ئیدی کێ هەیە لەو کوێستانە باسی مەرگی بزنە خۆشەویستەکەمی بۆ بکەم؟ بەدەم ڕێوە ملم شکا ئەوەندەی ئاوڕ بدەمەوە و خۆم و نەنکم لەسەر هێسترەکە لاسەنگ بین، هێدی هێدی هەرا و زەنای کۆڵان لە گوێمدا دەمرد و نەدەما، تا دەهات چۆڵ و خامۆشتر دەبوو، لەناو ئەو ترسەی خۆمدا ئیدی من هیچ سرتە و ورتەیەکم نەدەبیست، کە نەنکم زانی وازناهێنم و بەهەردوو لادا مل دەسووڕێنم و ئاوڕی دواوە دەدەمەوە، باوەشی ئەویش دونیای لێ تاریک کردبووم، بەهەر زەحمەتێکەوە بێ تێی گەیاندم کە دەیەوێ بەرزم کاتەوە و وا بکات کە ڕوومان لە یەکدی بێ و

منیش بتوانم سەربەستانە بەکامی دڵ دوور بڕوانم، لە بن باڵی نەنکمەوە تا چاو بڕ دەکا دەمڕوانی و کەسێکم نەبینی... ڕۆحی شیرین... تارماییەکەی... ستوونێک لە ڕۆشنایی باڵای... خۆی... دەربکەوێ و من فریا بکەوم گوڵەکەی بۆ هەڵبدەم، چاوانم ڕەشکەوپێشکەی دەکرد و هیچم نەدەدی... بەلای ڕاستدا ڕوانیم، بەسەر ڕەزی دار هەنارە زڕەکانەوە ڕووەو خەرەندەکە چاوەکانم ئازاد کردن... بەتەمای ئەوەی کە مەودای دوور چاوانی لێڵم ڕۆشنتر بکەنەوە، کەچی لە قووڵایی خەرەندەکەوە تەمومژێکی تەنک ڕووەو ئاسمان بەرز و بەرزتر دەبۆوە و، بەسەر هەردوو لێواری خەرەندەکە دەکشا و پەلەی بوو بگاتە ناو ڕەزی دار هەنارە زڕەکان و... هەر واش بوو... لە چاوترووکانێکدا لە تەمێکی سووکەوە چڕ و چڕتر دەبۆوە بەناو دار هەنارەکاندا پێچی دەخواردەوە، هەروەک ئەوەی هێشتا لەناو حەکایەتەکانی نەنکمدا بم و تەمێکی چڕ غەرقم کا... تەمومژەکە دەهات و دەکشا و ڕەزەکەی لە چاوانم شاردەوە، یەکە یەکەی ماڵەکانی گەڕەکی خوارێ، تەمومژ میهری نواند و کەمەکێ خۆی گران کرد و وەک ئەوەی گەمەیەکم لەگەڵدا بکا و پێم بڵێ هەتا نەهاتووم لەو گەردەلوولە بستە باڵایە بڕوانە... هەر واش بوو... کشانی تەم بەو چڕی سەر ئاسمانی ڕەزەکە نەگەیشتبووە ناو کۆڵانەکەی ئێمە، بەڵام دەهات... ئاسمان و خۆری لێ شاردمەوە، بەپەلە ڕوانیم، دوور، تا ئەو شوێنەی مەزەندەم دەکرد بەر قاپییەکەی ماڵی شیرین بێ... لەو دوورەوە... دەنێو باڵای بەناو یەکدیدا سووڕاوی کۆمەڵێک ژنی عەبا بەسەر کە بەهەشتاوی دەهاتن و داد و فیغانیان دەگەیشتە گوێم گەردەلوولێک لە ڕۆشناییم دەبینی، لەناو تەپ و تۆزی هەڵساو لە بەرپێی ژنەکان و تەمومژی لەسەرخۆ کشاو لێم ون دەبوو... پاشان دەهاتەوە، لە پشت فرمێسکەکانی خۆمەوە ئەو ستوونی نوورەم دەبینی کە دەیخواست لە تەمومژدا نەخنکێ و فریام بکەوێ، تاوتاوێک تارمایی ئەو ڕووناکییە باڵای دەکرد و تاوێکی دیکە ئەوەندەی بستێکی دەمایەوە و لە تەمدا دەکوژایەوە و لە تەپوتۆزی بەجێماو لە





تەشک و تیرێژی کراس و کەوا و عەبای ژنەکاندا دەخنکا، تاوێک خەنی دەکردم و تاوێک غەمگین، هەر دەهات و هەوڵی دەدا لەناو ئەو تەمومژەدا لە درەوشانەوەی خۆی نەکەوێ، دەت وت چرایەکە و کز دەسووتێ... دوا پرتەوی گڕی مۆمێکە و نایەوێ بفەوتێ، لەو دوورەوە لە دوو چاوی تەڕ و پڕ لە باقوبریق دەچوو کە دەنێو تەپوتۆزی جێماو لە کاروان، جێماو لە کۆمەڵی ژنی عەبا بەسەر و دەم بەهاوار، جێماو و ڕاکردوو لە ترسی کشانی تەمێکی چڕ... بۆ من دەبریسکانەوە... دەکوژانەوە و دەبریسکانەوە، هەر دەت وت لە گۆمێکی بەفراودا هەڵکێشراوم وەها هەڵدەلەرزیم و دانەچۆقەم پێ کەوتبوو، ملم بەهەردوو لادا دەکەوت، بەزۆر سەرم ڕاگیر دەکرد و لەبن باڵی ڕاست و چەپی نەنکمەوە دەمویست ئەو تۆزە نوورە... ئەو گەردەلوولە ڕەنگین و جێماوە بدۆزمەوە، ئەو تۆزە نوورەی گەمەی بەڕەشی عەباکان دەکرد، من بەهەویای هەڵهاتنی هەتاوی ئەو بووم لەناو تەم و تاریکی ئەو ژنە عەبا بەسەرانەدا، هەندێ جار ئەو تارماییە وەها دەدرەوشایەوە کە بەشەوارەی دەخستم، هەر دەت وت ڕاستەوخۆ دەڕوانمە دوڕ خۆر، دەت وت خۆی لادەدا ئەو نوورە پاکە، خۆی گرمۆڵە دەکرد، خۆی لادەدا تا نەکەوێتە بن دەست و پێیان، لە ترسانا بزر دەبوو... پاشان وەدەر دەکەوتەوە... دڵی خۆم خۆش دەکرد کە ئەو تارماییەی گەمە لەگەڵ چاوەکانم دەکا... گەمە بەخەیاڵ و خولیام دەکا... هەر دەبێ تارمایی شیرینی شیرین بێ، ڕۆشنایی دەوری تارماییەکە کە لە ڕاکردن ماندوو نەدەبوو، هەر هەمان نواڵەی پاکی دەوری باڵاکەی لەو بەیانییە زووانەدا کە لە دەوری زۆپاکە سەمای دەکرد و گڕ و گەرمی و ڕووناکی بەڕۆحی سارد و تاریکم دەبەخشی، نەمدەزانی ئاخۆ ماوە یان مردووە، نەمدەزانی چەندەها شەو و ڕۆژە نەخۆشی و لە جێکەوتنم لێکدی کردووین، لەناو سیحری ئەو بەیانییەدا و وەڕێ کەوتنی مردووانەی ئەو کاروانەی کتوپڕ هات و منی لە پێخەفە ساردەکەم دزی هەر لە خەون و خەیاڵ دەچوو، وردبوونەوە و گەڕان و تێڕامانم لە سێبەری ئەو هەموو ڕەنگە پەرش و بڵاوەی دەوری تارماییە

خۆشەویستەکەم گێژ و کاس و وڕیان کردم، دەت وت هاوار و ناڵە و گریانی ژنە عەبا بەسەرەکان تەمەکە دەتترسێنێ و لەگەڵ هەر زریکەیەک تەمەکە چەند هەنگاوێک دەڕەوییەوە لە پاشیدا، ئەو ژنانە وەک ئازیزمردەیەک بەچەپۆکان لە لاڕوومەتی خۆیان دەدا، ببوون بەدیوارێکی ئەستوور و بڵند... نەیان دەهێشت نێوان من و ئەو نوورە بستە باڵایە تەواو کوێر بێتەوە، بەڵام خۆ نەشیان دەهێشت پێشیان بکەوێ، من هەر چاوەڕێ بووم خێراتر غار بدا و بەو هەنگاوە سستانەی فریام بکەوێ و بەر لە هەڵوەرینی پەلکی گوڵەکان لەناو چنگمدا بمگاتێ، دەمخواست تا زووە بەفرمێسک و ماچ گوڵەکەم بشۆمەوە و گەشاوە و تەڕ بۆی هەڵبدەم، تا ئەو مەودایەی تەمومژ لێ دەگەڕا لە سەربانی ماڵەکانم دەڕوانی، بەر قاپییەکان و ناو حەوشەکان، جگە لە ماڵی شیرین زۆربەی خەڵکی لەبەر دەرگا بەپێوە یان هەڵترووشکابوون، چ لە سەربانەکان و چ لەناو حەوشەکاندا مەزن و منالم دەبینی کە تێک قژقژابوون، ژنەکانی بەر دەرگا زۆر زەبوونانە و لارەمل لە منیان دەڕوانی، جاروبار پیاوانی سەرودوای کاروانەکە و نەنکم، لەژێر لێوەوە، بەدەست بەرزکردنێکی قورسەوە سڵاویان لەو حەشامات و عەزازیلە دەساندەوە، سەپان و شوان و شێرۆ و مامەندم بینی، جانتا بەشانەوە، تەندروست و بزێو خۆیان دەگەیاندە کلکی هێسترەکە و من و نەنکم لاسەنگ دەبووین، بەشەرمەوە، شەرم لەوەی کە من نەخۆشم و ئەوان تەندروست، بەدرۆ بەڕوویاندا دەخەنیمەوە، دەت وت دڵم خوێن دەدەڵێنێ، چ شەرمێکی گەورە و چ مردەنییەک بوو بەسەر هێسترەکەوە وەک منالێکی چکۆڵە و جیقن دەلەنگیمەوە... هاوارم کرد خودایە بۆ نامکوژی... تۆ بۆ ڕقت لە منە؟ هاوارەکەم لە دڵما خنکا و سەد جار وتم: خودایە... گووم خوارد... لە گووی سەگ... ئاخر نەنکم هەڕەشەی لێ کردبووم و دەی وت گەر خەیاڵ و ختوورەی خەراپ بەدڵتدا هات... هەتا زووە پەشیمان بەرەوە... دەنا لای خوا ئاسانە هەردوو چاوانت کوێرکا... من حەزم دەکرد بەربیمەوە و بکەومە ژێر سمی هێسترەکە و ڕاست نەبمەوە، ئاخر





دوای دۆڕانی شیرین و بزنە شێت من چی لە خۆم بکەم؟ سەرم هەڵدەبڕی هەر تەمومژ بوو، سەرم نەوی کرد و لەو دوو سێ دوکانەم ڕوانی کە تازە دەکرانەوە، لەو ژنە ڕەوەندە ماست فرۆشانەی بەر دەمی چایخانەکە، لە چەندین کەری بارکراو بەچرووی بڕاوی ناو شاخان کە لەوە دەچوو خاوەنەکانیان لە ژوورەوە نان و ماستی بەیانی بخۆن، بەدەنگی نەنێ هاتمەوە سەر خۆم کە بەدەنگی بەرز «ئایەتەل کورسی» دەخوێند و فووی ساردی بەسەر سەری مندا بڵاو دەکردەوە، من دەمزانی ئیدی تا دەگەین بەکوێستان لێ نابێتەوە، بەسەر سەرمەوە، دیسانەوە، ئەو پۆلە چۆلەکەم بینییەوە کە لەسەر شاتووەکەی بەر دەمی ماڵی شیرین-ەوە بەسەر سەری من و کاروانەکەدا هەڵفڕین، نەمدەزانی چۆن دەتوانن ئەو تەمە چڕە شەق بکەن... چۆن لێکدی بزر نابن؟ هەر سەرەتاتکێم بوو... دوا ئومێدم، لەو بەیانی خەم و نەخۆشی و کۆچەدا، لای نانەواکە بوو، هەموو کوڕ و کچەکانم ناسییەوە، هەموو ئەو ژن و پیاوانەی پەلەیانە زوو نانیان دەست بکەوێ، شەڕ و گێچەڵێکی زۆرم بیر کەوتەوە لەسەر نۆرەبڕی، شەڕی دەستەویەخە... تف و جنێو، من هەموو بەیانییەک نۆرەی خۆم بەشیرین دەبەخشی، دەمزانی چەندە شەرمن و دڵناسکە... لە ترسی باوکی هەمیشە بێ ئۆقرە دەستەکانی هەڵدەگلۆفی و شپرزە و پەرێشان لە نانەواکەی دەڕوانی، ئەویش بێ باک قوونی لە هەمووان دەکرد و چاو و برۆی لە گڕەکە دوور دەخستەوە و بەدەم گۆرانی وتنەوە نانی پێوە دەدا... هەر هەمان گۆرانی...

**«ئەرێ کردووتە عادەت**<br>
**گیانەکەم هەیوان دانیشتن**<br>
**ئەرێ چاوان مەگێڕە**<br>
**جوانێ... بۆ عاشق کوشتن»** .

پاشان بێ باکانە ئاوڕی دەدایەوە... چەند نانت دەوێ؟ بەڵام من مەرگی خۆم دەخواست بزانم لەگەڵ کێیەتی... نەک من... کەس نەیدەزانی، شیرین

وەک گەردەلوولێکی شین و ڕۆشن بەهەڵەداوان ئەم دەست و ئەو دەستی بەنانەکە دەکرد تاوەکو پەنجەکانی نەسووتێن... غاری دەدا تا فریای قاوەڵتی باوکی بکەوێ، من هەمیشە درەنگ نانم بەردەکەوت... نانەواکە، هەمیشە، سزای دەدام چونکە نۆرەی خۆم دەدا بەشیرین، نانەوایەکی چاو باشقاڵ... بەدەم گۆرانییەوە لە کچە پارچەڵەکانی دەڕوانی و بزەی دەهاتێ، بەیانییەکیان دوا کەس بووم و هەر چاوەڕێ بووم... کەچی زۆڵانە لەژێر سمێڵەوە خەنییەوە و وتی: خڕ و خەپانە ها... پاشان بەپلارێکەوە وتی:

**«لێت نەگۆڕێ... وا بزانی تۆ فەرهاد-یت و ئەویش شیرین!»** .

من لەوە تووڕەتر بووم گوێ لەو تیر و توانجانە بگرم... کە شیرین دوور دەکەوتەوە و دەگەیشتەوە ژێر شاتووەکە من دڵم پڕ دەبوو لە گریان و هەناوم پڕ لە فرمێسک، بۆ دواجار و بەپەلە سەیری بەردەمی نانەواخانەکەم کرد... خودا هاوار... شیرین-م نەدی... لە حەیبەتا... بەپەلە و شێتانە دوو چاوی دیکەم قەرز کرد و لە دار و دیوار ڕادەمام، لە دەرگا و پەنجەرە و قەنتەرەکان، لە قاڵدرمەکان کە دەچوونەوە سەربانەکان، لەو مناڵانەی لە ڕاکەڕاکەی دوای کاروان وەڕس نەدەبوون... هەر دەگەڕام گەردەلوولی ئەو ڕووناکییە ڕەنگاوڕەنگە بدۆزمەوە کە لەناکاو لێم بزربوو، سەرزەنشتی خۆم کرد کە نەدەبوو غافڵگیر بم، کۆڵانەکە تا دەهات لە دواوە بەرتەسک دەبۆوە ژنە عەبا بەسەرەکان ساتمەیان لەیەک دەکرد و تارماییییە ڕۆشن و خۆشەویستەکەی منیان خستبووە ناو تەمومژ و گێژەلووکەیەکی تاریکەوە، دەمزانی ئەوەندە نابا و ئیدی لە پێچێکدا کۆڵانەکەی خۆمان جێ دێڵێن و دەکەوینەوە ناو کۆڵانێکی تەنگەبەرتر... پاشان دەچینەوە سەر ئەو ڕێ بەردەڵانەی بەناو شاخ و کێوەکاندا دەمانباتەوە زارکی گەلییەکی دەم کراوە کە تا مەودایەکی دوور ڕووبارێک بەدەم هاژە و خوڕەی کەفچڕینەوە لەگەڵمان ڕێبوارە تا ئەو وەختەی بەتەواوی لەناو تەمومژ و هاژەی چەمی بەخوڕی خەرەندەکە بزر دەبین... کتوپڕ نەنکم وەئاگای هێنام:

**«چیتە ڕۆڵەکەم... بۆ دەنگت نییە؟»** .





لە دەنگی مردووی نەنێدا زرنگانەوەی زەنگێکی ترسناکم بیست، هاڵاوێکی گەرم و هەناسەیەکی بۆگەن دایگرتم، ناچار و بەپەلە دەموچاوم لە مێخەکبەندەکەی نزیک خستەوە، دەترسام بەبۆن بکەوم یان ئەو هاڵاوە قورس و گەنیوە بمخنکێنێ... دوور دوور... چاوانم بەسەر پنتێکی زۆر چکۆڵەوە ڕوا بوو... کە هێدی هێدی دەبوو بەخاڵێکی ڕۆشن و گەورە... دوعام دەکرد و دەپاڕامەوە کە بەرلەوەی بگەینە ئەو پێچە، کتوپڕ، وەک ئەوەی کە لە حەکایەتەکانی نەنکم ڕوودەدا شیرین دەربکەوێ، گوڵەکەی بۆ هەڵبدەم و بەهەردوو چاوانی پڕ لە گریانم ماڵئاوایی لێ بکەم، هەموو دەنگەکان لە ڕۆحمدا دەمردن، هەموو ڕەنگەکان لە چاوانما دەکوژانەوە، کەللەم کاس زرنگەی دەهات، ورتەورتی نەنێ بەدەم خوێندنی ئایەتەل کورسییەوە هەراسانی کردبووم، ئەو ورتەورتە دەت وت بەردی ئەو شاخانەیە و بەسەر مندا دەڕمێن، تەمەکەش هەر دەهات و دەکشا و چڕتر دەبوو، خۆی لە دیوارەکان، دەرگاکان، درەختەکان، مەردوومەکان هەڵدەسوو... تا دەهات پان و بەرینتر دەبوو، هەر هەموو شتێکی لە خۆیەوە وەردەپێچا... زۆر چڕوپڕ لەناو قووڵایی خەرەندەکەوە هەڵکشا... تەنک تەنک بەسەر سەری هەمووماندا لە ئاسمانەوە دادەکشا، هەر زوو زانیم ئەوەندە نابا و ئەو تەمە هەر هەموو دونیا دادەپۆشێ و هەناسەش سوار دەکا، ئیدی هەموو کەسێک و شتێکم لێ بزر دەکا، وەک هەمیشە لەناو ڕۆحی خەرەندەکەوە هەناسەی دەدا و دەتەنییەوە و یەکەمین شوێن کە داگیری دەکرد ئەو باخەی دار هەنارە زڕەکان بوو، هەڵدەکشا و ترۆپکی چیاکانی دەشاردەوە... دواجار ڕووەو ناو ماڵەکان گران دەکشا و هەر هەمووومانی لە یەکدی بزر دەکرد، وای لێ دەهات کە من پیاڵە و قاپی ماستەکەی بەردەمم، نەبینم، کە دەهات چ لەبەردەمی ماڵان بووایە، چ لەژێر شاتووەکە و یان لە حەوشەی مەکتەب: شیرین-ی لە من ون دەکرد، هەتا گەر لەبەردەمی نانەواخانەکەش بووایە گڕی تەنوورەکە نەیدەتوانی ئەو تەمە زۆرە چڕە بڕەوێنێتەوە، گەر لەبەر مێگەل بوومایە مەڕ و بزنەکانی لێ

ون دەکردم، من دەمزانی کەی ئەو تەمە دەکشێ... چونکە بەر لەوە بزنە شێت عاقڵانە دەیقاڕاند و خۆی پێوە دەنووساندم، لاملی لە بەلەکم هەڵدەسوویی، هەر لە دوای دارژانی ئەو تەمەدا بوو کە شیرین دەهاتە ژێر باڵم، کەچی لەو بەیانی کۆچ و لێک دابڕانەدا چەندە ئەو ڕێکەوتە ناشیرینە پەست و غەمگینی کردم... بەڵام نا... لە دوای نائومێدییەکی درێژخایەن دیسانەوە کەوتمەوە شنەشن و باڵەفڕە و شاگەشکەبوون، دوو چاو لە دوورەوە دەبریسکانەوە، دڕیان بەتەمەکە دەدا، دوو چاوی گەورۆنە و پڕ گریان کە لەوە دەچوو ڕێ لەبەردەم تارماییەکی چکۆڵە و بستەباڵادا ڕۆشن بکەنەوە... لەبەردەم ڕۆحی گەردەلوولێکی ڕەنگاوڕەنگدا دڕ بەتەم و تاریکی بدا و... بێت و... بگاتە کاروان، دڵم خۆش بوو کە گوێم لە بەریەککەوتنی ناڵی ژێر سمی هێسترەکە و بەردەکانی سەر ڕێگا بوو... لە گوێمدا (ئایەتەل کورسی)یەکەی نەنکم خۆش دەهات، هەتا دەهات توندتر بەباوەشی خۆیەوەی وەدەنووساندم، هەناسەم خێراتر... بەڵام هەر تەنگ و سوار، بەزۆر سەرم لەژێر باڵی نەنکم دەرباز دەکرد تاوەکو ئەو ڕۆحە درەوشاوەم لێ ون نەبێ، دەمزانی ئەوەیان دوا هەلە و دوا بەخت... هەر دەبوو مەزەندەی ئەوە بکەم کە ئەوەیان جگە لە ڕۆحی ڕۆشنی شیرین هیچ شتێکی دیکە نییە، لەوە دەچوو لە دوورەوە ئەو دوو چاوانەی ناو تەمەکە بگرین، چاوەکانی تا دەهات ڕوونتر و تەڕتر دەدرەوشانەوە، تا نزیکتر دەکەوتەوە من پتر لێ دەگەڕام گوڵەکەی ناو دەستم هەناسە بدا و ببووژێتەوە، بەپەلە و ڕۆح پەروەرانە بۆنم دەکرد، وام دەزانی گەر بۆنی نەکەم هاڵاوێکی بۆخن و بۆگەن دەمخنکێنێ، خۆزگەم بوو خێراتر بێ و تەم شەق بکا و بگاتە لام، گەرما و گەرم بۆنی هەناسە و فرمێسکەکانم لە گوڵەکە بکات، جاروبار چاوە ڕۆشنەکانی تارماییەکەم لێ بزر دەبوو... لەناو گێژەلوولەکەی جێماوی ژنەکاندا دەخنکا و بابەخولەیان پێ دەکرد، ئەو کۆمەڵە ژنەی لەو بەیانییەدا وەک قەلەڕەش بەدەم گریانەوە دەیان قیغاند و لە ناکاو لە ناو ئەو تەمەدا ڕسکان، دەبوو هەر ئەوە بێ: کەسێک





لە ئاواییدا مردووە و ئەوان دەچن گەرمەشین بەجۆشتر بکەن، تاوتاوێک تارمایی ئاشنا و ڕۆشنا بەڕۆحم ئاوڕی پڕ لە ترسی دەدایەوە بەو دەلیلەی بریسکەی چاوانی لە من دەکوژاندەوە... دەهات... دەهات سووکەڵە و پێ هەڵگرتوو... لەوم دەڕوانی و لە هەموو دونیا دابڕابووم، تەمومژ وەها لوولی کردین کە من تەواو لە کاروان دابڕابووم، بەلامەوە سەیر بوو کە نەنێ نەدەترسا لەناو ئەو شاخ و داخانە ڕێ وێڵ بکەین، ئیدی من دڵم داخورپا... چونکە ویستم لە نەنکم بپرسم کە ئێمە واین لە کوێ... کەچی دەنگم نووسا و دەرنەهات، ژنە دەم بەهاوارەکانیش ئەوەندە بەتاو دەهاتن کە لەگەڵ خۆیاندا ئەو تارماییە ڕۆشنەی منیان ڕادەماڵی و دەیانهێنا، نوورێکی تەواو پاک و ڕۆحی گڕگرتوو لەناو ئەو تەمە چڕەدا... سەرەتا خانووەکانی دەوروبەری لێ بزر کردم، یەکە یەکەی هێسترەکان و پیاوان و ژنانی ناو کاروان، دەرگا و پەنجەرەکان، چەندە بێ کەس و تەنیا بووم بەسەر پشتی تەمێکەوە کە تاوێک ڕووەو سەر ترۆپکی شاخەکان هەڵی دەگرتم و تاوێکی تر ڕووەو قووڵایی خەرەندەکە، ترسام و تاس بردمییەوە، پتر خۆم گرمۆڵە کرد و پشتم وەها کووڕ کردەوە کە بڕبڕەی پشتم لەگەڵیا ژانی کرد، ڕۆحی تارماییە ڕۆشنەکەم وەک گێژبووبێ بەم لا و بەولادا دەکەوت و هەڵدەستایەوە، بێ ئاگا لە خۆم هاوارم کرد:

«**شیرین... شیرین...**».

نەنکم توند قرساندمی بەبەرسکی قوپاوی خۆیەوە تا هاوارەکەم دەرنەچێ و کاروان بڕەوێتەوە، تارماییەکە ڕۆشنتر لە جاران هەستایەوە و کەوتە دوام، سەرسام و ئەبڵەق بووم کە زانیم ئەو ڕۆحە شیرینە دەیەوێ بگات بەکاروان، دەمویست پێم بگا تاوەکو پێی بڵێم کە من چەندین شەو و ڕۆژ، بەر لەم سەفەرە، نەخۆش بووم، خەونم بەتۆوە بینیوە و ڕاچەنیوم، خەونی ترسناک بەهەڵدێرانی بزنەکەم... لە تۆم پرسیوە و کەس پێی نەوتووم تۆ لە کوێی، دەمویست گوڵەکە هەڵبدەم تا ئەو تارماییە بەدوو چاوی ڕۆشن و داگیرساوی ناو ئەو تەمە چڕە ببینێ و هەڵی بگرێتەوە، بۆنی بکا و بزانێ

هی منە، خۆزگەم دەخواست ئەم سەفەرە بەناو تەمدا خەونێک بێ لە خەونە زۆرەکانی شەوانی سووتانم لەناو گرانەتادا، ئاخر من بۆ هەمیشە زیندەخەونم دەدی: لە پۆل، بەدیار لەوەڕی مەڕ و بزنەوە، لە ماڵ، لەژێر دار هەنجیرەکەی خۆمان و شاتووەکەی بەرماڵی شیریندا، لە سەربان، هاوینان، تا خەو دەیبردمەوە دەچوومە ناو شانشینی ئەستێرەکان، لەگەڵ مانگدا سەفەری شارانم دەکرد، هەر بەخەیاڵ منی ترسنۆک دەچوومە ناو باوەشی خۆشی شیرین و خۆم بەقژی پەخش و پڕی دادەپۆشی، بۆ ساتێک هەستم کرد کە زۆر لێم نزیک کەوتۆتەوە و دەمبینێ و دەیبینم، تەم و تاریکی بۆتە شوورەی تەنکی چواردەورمان، لە قەد و باڵای ورد دەبوومەوە، گوێم زرنگایەوە بەپروشەی هەناسەی شیرینی، سۆزی ڕژاوی چاوانی دەیگریاندم، پەنجە بێ ئێسقانەکانی، پەنا گوێی وەک ئەو وەختەی لەبەردەمی زۆپاکەدا ئارەقەیان دەردەدا، هەردوو کولمی سووتاوی، پێڵووی داکەوتووی سەرچاوەکانی کە من حەزم دەکرد هەڵیان بێنێ تاوەکو خەم و قەهر و نەخۆشیم، بۆ دواجار، ببینێ... تا سکی پێم بسووتێ و لە ئامێزی خۆیم بگرێ و دیسانەوە لە ترسانا خۆم لەناو خەرمانی قژی ئەودا بشارمەوە، ئەوەندە نزیک بوومەوە کە بۆنی بن گەردنی کاسم بکات، بۆنی سینە و بەرۆکی ساوای، کەچی کتوپڕ لەگەڵ پرسیارێکی نەنکم ڕاچەنیم:

«**ئەوە خەوتووی ڕۆڵەکەم؟**».

تەم لێ نەدەگەڕا بزانم وام لە کوێ، توند لە ترسانا باوەشم کردەوە بەسینە و مەمکی چرچ و داقوپاوی نەنکمدا... خودا... چەندە تەنیا و هەتیو و غەمگین بووم، لە بری باوەشی نەرمی شیرین کەوتمە ناو هەناوی بەتاڵی نەنکم کە خیزە خیزی سینەی تاکە دەنگێک بوو دەنێو ئەو تەمە تاریک و چڕەدا بیسەلمێنێ کە من هێشتا ماوم و نەمردووم... دوای خنکانێکی درێژخایەن پرسیم:

«**لە کوێین نەنێ؟**».

مردووانە وتی:





«**نازانم ڕۆڵە... گوێم لە زەنگۆڵەی ملی هێسترەکانیش نییە... لەوە دەچێ لە کاروان دابڕابین...**».

لەناو ئەو زیندە خەوە خۆش و ناخۆشەدا چاوم لەو تارماییییە ڕۆشنە نەدەترووکاند، دوور و نزیک دەکەوتەوە... هەر لەتری دەدا و هەڵدەستایەوە، لەنێو گەردەلوولی قەبە و بڵندی ژنە پرسەدارەکان ون دەبوو، تاوێک و پێشیان دەکەوتەوە، بەڵام تا دەهات تەمەکە چڕتر دادەڕژا و ئەو دوو چاوە ڕۆشنەی لێ ون دەکردم، ترسام ڕۆحی شیرین بێ و هەنگاوی ورد و چکۆڵانە و ماندووانەی دەرەقەتی هەڵاتی کاروانەکە نەیەت، چاوەڕێ بووم کە ئەگەر ئەمجارەیان دەرکەوتەوە، نزیک بێ یان دوور، گوڵەکەی بۆ هەڵبدەم، بەڵکو ئەوە خوایە بیبینێ و هەڵی بگرێ و بۆنی بکات، بۆنی هەناسەی منی نەخۆش، فرمێسکی گەرمم دەکرا لەو بەیانییەدا، بەسەر پەڕەکانییەوە، لە شەونم بچن، دڵم خۆش بوو... چونکە دوا هەوڵ و تەقەللای دەدا بزری نەکەم و بزرم نەکات، هەر دەت وت لە تەکمایە و ڕێ دەکات، من بریسکەی چاوەکانی شیرین-م دەناسییەوە... ڕووی ڕۆشنی، خەندەی شەرمنی سەرلێوانی ئەو کاتەی دەیەوێ شتێک بڵێ و بۆی نایە، نیگای دەکردم... جوامێر و سوارچاکانە دەنووشتامەوە... دەنووشتامەوە تا ئەو ڕۆحە ماندووە بگرم و سواری هێسترەکەمی بکەم و ڕووەو کوێستانان لەگەڵ خۆمدا بیبەم... دەدرەوشایەوە، دەت وت ڕۆحی جۆگەلەیەکە و لەژێر خۆرەتاوێکی پەنهاندا بریسکە بریسک خۆی ڕووت دەکاتەوە، بەئاشکرا قژی درێژیم دەدی، پەخش و پەرێشان، لەژێر تەپ و نمی تەمەکەدا ئاونگی لێ دەتکا، کە غاری دەدا پەخش و بڵاو لەسەر کەفەڵ و نێکی ڕاست و چەپیدا شەپۆلی دەدا، هەر کتومت لەناو ئەو تەمەدا لە ڕۆحی سێبەر و تاو دەچوو، جوان جوان لێی ورد دەبوومەوە، هەمان کراسی کلۆشی جاران کە (با) پڕی دەکرد و تا سەر هەردوو ئەژنۆی لە من بەدەردەکەوت و ڕۆژانی سەمای بەر زۆپاکەی وەبیر دەهێنامەوە، دەستی هەڵدەشەقاند، باڵەفڕەی بوو سەری

پەنجەکانی بەر سەری پەنجەکانم بکەون، بەسەر پشتی تەمەوە دوورتر بووم لەوەی دەستی بمگاتێ، هێدی هێدی هەستم دەکرد من سواری تەمێک بووم و بەحەواوەم، چونکە ئیدی تەواو... چیتر هێسترەکەم نەدەدی، گەر بۆنی هالآوی هەناسەی بۆخنی نەنکم نەبووایە کە تێکەڵ بەڕۆحی مێخەکبەندەکەی دەبوو بڕوام نەدەما کە من هێشتا وام لە باوەشی ئەودا، ئاخر نەنکیشم تاوێک لەژێر تەمدا ونم دەکرد و تاوێک دەهاتەوە، بەدەم بۆنکردنی گوڵەکەوە دەمزانی پەلک بەپەلک وا خەریکە بمرێ، چ فەرهاد-ێکی ناشیرین بووم، من سوار و شیرین پیادە، دەمویست لەسەر پشتی تەمەکە دابەزمە خوارێ، تارماییەکی ئەرژەنگ توند منی دەگوشی و بەرزەفتی دەکردم تا نەجووڵێم، لەناو ئەو تەمە چڕەدا پارچەیەک لە ڕۆحی شەبەنگ و نوور دەگریا و هەنسکی هەڵدەدا، بەوەی کە تەمەکە لەسەر هەردوو چاوەکانم دەنیشت و تانەیەکی دروست دەکرد و دەمزانی کە ڕێگاکە چەندە بەرتەسک و تەنگە، دەترسام ئەو تارماییە زۆر خۆشەویستەم بکەوێتە ژێر هەر چوارپەلی هێسترەکە و بیهاڕێ، ئەگەر پرمەپرم و هەناسە سوارییەکەی نەبووایە من هەر وام دەزانی بەسەر پشتی تەمەوەم، ترووسکەی چاوانی، خەندەی شیرینی، قژی ڕەشی تەم داپپۆشین، بێ دەستەڵات و زەبوونانە دوعاکانی نەنکم دەخوێند تا ئەو تۆزە نوورە دەربکەوێتەوە، لە دوورەوە گوێم لە ناڵەی جەرگبڕی ژنەکان بوو کە دەت وت تا کوێستان بەدوای کاروانەکەوە دەبن و... هەردێن، دەگریان و دەلالآنەوە، ئەو تارماییە غەمگینانەی لەو بەیانییەدا ببوون بەبەشێک لە ڕۆحی ئەو تەمەی هەموومانی لە یەکدی بزر کردبوو، تێکەڵ بەو گریان و داد و فیغانە، گوێم لە قاقای ناشیرین و ناقۆڵای کۆمەڵێک پیاوی بێ باک بوو کە تاوتاوێک تەمەکەی دەترساند و دەڕەوییەوە، لە گەرمەی یەکێک لەو قاقایانە بوو کە من پڕ و تەواو ڕۆحی تارماییە ڕۆشنەکەی خۆم بینییەوە کە هەر دەت وت بازنەیەکە لە نواڵە و نوور، لەژێر دەست و پێی ژنەکان دەکەوت و ڕاست دەبۆوە، دەیویست خۆی لابدات و ڕابکات و





دەنگی بەمن بگات، هاوار بکات تا فریای بکەوم، هەر لەو ساتەوەختەدا بوو لەگەڵ قاقا و پێکەنینی ترسناکی ئەو پیاوانەی کە من مەزەندەم دەکرد لە قووڵایی خەرەندەکەوە بێ ئاسمانی پڕ لە تەمومژی سەر سەرم بەبرووسکەیەک تەقییەوە، نازانم چڕبوونەوەی تەمەکە لەسەر ڕووم خەستتر دەبۆوە و دڵۆپ دڵۆپ لەسەر لووتم و تەوێڵمدا زەنگوڵەیان دەبەست یان پروشەی باران بوو...؟ نەمدەزانی... ئان و سات، لە چاوترووکانێکدا دونیا ڕۆشن بۆوە و من پەلەم بوو گوڵەکە هەڵبدەم... چونکە هێدی هێدی گوێم نەدەما، چاوم تاریکتر و... دەنگیشم دەرنەدەهات، بەسەر تەمەوە ون دەبووم و دیسانەوە من و تارمایی شیرین-ی لێکدی بزر کرد، بڕیارم دەدا و پەشیمان دەبوومەوە... دواجار وتم چش لە بەختی ناپوختم... دەت وت گوڵە پەژمووردەکەم دڵی سیسی خۆمە ڕووەو لای ئەو گەردەلوولی نوورە هەڵی دەدەم، بەدەم هاوار و زریکەوە دەمبینی چۆن دەیەوێ وەک ڕۆحی (با)... دەیەوێ هەڵبکات و گوڵە هەتیوەکەم ڕووەو ئاسمان و باوەشی خۆی هەڵبگرێ، بەڵام... نا... لەژێر دەست و پێی تارمایی ژنە ڕەشپۆشەکاندا هەڵپڕووکا، فریای نەکەوت... نەیدەتوانی و دەستی نەگەیشت بەگوڵی هەڵوەریو و بێ ناز کەوتووم لەناو تەمومژ و... تۆز و خۆڵدا، بێگومان بووم لەوەی کە ئەویش وەک ڕۆحی پڕ لە سێبەر و تاوی شیرین دەکەوێتە بەر پێیان و هەڵدەپرووکێ، یەکەم جارم بوو کە بەدەم هەڵمژینی هەوای پاکی ناو شاخان سینەم پڕ بێ لە قەهرێکی کوشندە، بەپێی ئەو هەموو پێچە ڕکانەی ڕێگەکە و گێژبوون و سەرسووڕانم دەمزانی تا دێ لە زارکی خەرەندەکە نزیک بووینەتەوە... ڕووەو هەناوی ئەو زەندۆڵە دەم کراوەیە دەچووین کە هاژەهاژی ڕووبارەکەی دەیترساندم من و نەنێ و هێسترەکە بکەوینە ناوی و بخنکێین و تا ئەبەد کەس نەماندۆزێتەوە، دەمزانی لەوێ لە قووڵاییدا تەمەکە خەوتووە و کەچی هەناسەی تاریکیشی دونیای داگیر کردووە، تەواو گومانی ئەوەم دەکرد کە لە کاروان دابڕاوین و... نەنکیشم تەواو خامۆش و بێ ورتە نە ئایەتەل کورسییەکەی دەخوێند و نە دوعاکانی

دەنارده بەر قـاپی خـودا، تەواو... من گـومـانم هەبـوو لە باوەشی ئەودابم، گـومـانم لەوەش هەبوو کـە بەسـەر پشـتی هێسـترەکـەوە بین... نـاچار بەدەم قـوڵپی گریانەوە لە نەنکم پاڕامەوە و تکام کـرد کە تا دەگـەینە کـوێسـتان حەکایەتێکی درێژم بۆ بگێڕێتەوە و... ترسی خنکانم لەناو تەم و ئەو ڕێگا دوورەم بڕەوێتـەوە، کـەچی بەگـریانـێکی کپ و خنکاو وەڵامی دەدامـەوە، گـریانێکی قـووڵ، پەنهـان و نەبڕاوە، کـە لە سـینەی تـەنگی نێـوان هەردوو مـەمکە وشکەوەبووەکـانی دەڕژایە نـاو سـینە و ڕۆحی من؛ دوا حـەکـایەتی لێکدابڕان و مـەرگ ڕۆحی سـاوامی داغـان دەکـرد و هەرگـیـز نەیدەهێشت منیش ژێر ببـمـەوە... دەمـزانی لەناو ئەو تـەمـەدا نە نەنکم، نە دایکە، نە شیرین، نە بزنە شێت، نە خوشک و نە براکانم... هیچ کـەس فرمێسکەکانم نابینێ... چیتر لەوەش نەدەترسام لەو دەردە ڕاست نەبمەوە و لەو کـوێسـتانە دوورەدا بمرم، دواجـار هەنسکی من و نەنێ تێکەڵ دەبوون، لە ناکـاودا بەترسێکەوە ناڵاندی و قرخەیەک لە قـوڕگی عـاسێ ما... وەک ئەوەی بمرێ یان خەو بیباتەوە هەمـوو گرانایی سەر و سینەی بەسەر سەری منی جیقندا کـەوت، سـەر و ملم لەژێر قـورسـایی نەنێـدا دەشکا، من هەر لە خـۆیم بیسـتبـوو کە لەشی کـەسێکی مـردوو دوو قـات گـرانتـر دەبێ، دەت وت کەوتوومەتە ژێر کەرتە شاخێک و هەناسەم بۆ دەرنایە، هێدی هێدی... نە گـوێم دەمـا... نە چاو... تـازە مـەحـاڵ بوو تـارمـایی ڕۆشنی شـیـرین فـریام کـەوێ... تا دەهات نەنکم بەسـەرمـا دادەکـەوت و بەسـەر خـۆمـدا دەینووشـتـاندمـەوە، هەروەک ئەوەی بیـەوێ بمشـارێتـەوە یان بمبـاتەوە ناو هەناوی ساردی خۆی، تا دەهات هەردوو باسکی باریکی لە منەوە دەئاڵاند و توندی دەکرد، ئەوە قورسایی لەشە لاوازەکەی نەبوو کە منی دەخنکاند، هەسـتم دەکـرد من وام لەژێر گـرانایی ئەو هەمـوو حـەکـایەتە زۆرانەی وان لەناو کەللە سەری نەنێدا، لەژێر قورسایی ئەو هەموو پاڵەوانانەی جارێک دەبەزن و جـارێک سـەردەکـەون، ئەو هەمـوو تەلیـسـمـانەی ناشکێن، ئەو هەمـوو دێـوانەی کە دەکـوژرێن خـوێنیـان جۆگـەلە هەڵدەبەستێ، ئەو هەمـوو





شارانەی پڕن لە دز و چەتە و پیـاوکـوژ و جوامـێر، ئەو هەمـوو عـاشـقـانەی دەمـرن و نـاگـەن بەوەسـڵی یار... ئەو ئەژدیهـایانەی بەری ڕووباریان دەگرت و... ئەو هەمـوو سیـمرخەی بەسەر شاراندا دەیان گەڕاندم... ئەو هەمـوو سـاڵ و ڕۆژ و مـانگانە... ئەو هەمـوو کـەلاوە و کـۆشکانە... من دەمـزانی سـینەی نەنکم گـەلێ لەوە تەنگترە جێی ئەو هەمـوو مـەملەکـەتانەی تیـا ببێـتـەوە... هەر بۆیـە ئەوەندە گـران بەسـەر سـەرمـەوەیە... وەها گـەمـارۆی بـاڵا سـاوا و کـوڵەکـەمی دا کە ئیـدی تەواو... مـن هیـچم نەدەدی... هیـچم نەدەبیـست... هاژەهاژی چەمەکەی ناو خەرەندیش لە هەردوو گوێمدا دەمرد و... دەخنکا... خـۆیشم بەدەم قـوڵپی هەنسکەوە هەناسـە بەهەناسـە... دەخنکام و... لەناو تەمدا بزر دەبووم...!

پاییز و زستانی ٢٠٠٢